به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

* ناوی پەڕاو : لەفەیس بوکەوە

* کۆکردنەوەی : :ئاوات محمد

* تیراژ : ٢٠٠٠ دانە

* ژمارەی سپاردن : ١٢٠٥ ساڵی ٢٠١١ کتێبخانەگشتیەکان

* چاپی: دووەم ٢٠١٤

## پێشەکی

سوپاس وستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهان و درroودو سەلامیش لەسەر گیانی پێشەوا و رابەرمان و یار و یاوەر و شوێنکەوتووان.

ناميلكەی لە فەیس بوکەوە هەوڵدانە بۆ گەیاندنی هەندێك بابەتی گرنگی فەیس بووك كەرەنگە زۆر لە خوێنەران پێیان نەگەیشتبێت و ئێمەش بەزەروورى دەزانین كە خوێنەران ئاگاداری ئەو بابەتانە بن .

بەهیوای دوعای خێرتان.

## داخرانی عەقڵی موسڵمان :

ئەمە ناونیشانی پەڕاوێکە کە دکتۆر رۆبەرت رایلی ئەمریکی نووسیویەتی ، لەساڵی ٢٠١١ دا ، ناوبراو وەك لێکۆڵەرێك بە قوڵایی مێژووی ئیسلامدا ئەچێتە خوارەوەونموونە دێنێتەوە لەسەر داخرانی عەقڵی موسڵمان و دواکەوتنیان و هەڵنەسانەوەیان پاش ئەو کەوتنەی کەکەوتن .

بیرو بۆچوونی ئەم دکتۆرە هەرچیەك بێت ، گرنگیەکەی لەوەدایە کەچۆن سەدان بنکەی لێکۆڵینەوە شەوو رۆژ لەکاردان بۆ خوێندنەوەی عەقڵی موسڵمانان و هەرچی سیاسەتی غەربیش هەیە لەسەر ئەو لێکۆڵینەوانە بنیات دەنرێن .

ناوبراو نموونە بە قسەیەکی محمدی کوڕی عبدالوهاب دێنێتەوە کەوتوویەتی (فکر و کفر وەك یەکن چونکە هەریەکەیان لەسێ پیت پێکهاتووەو هەمان پیتن کەدووبارە دەبنەوە ).

هەروەهادەڵێت : بەلای هەندێ موسڵمانەوە هەموو ئیبداعێك بیدعەیەو هەموو بیدعەیەكیش لەدۆزەخدایە .

دیارە دەسەڵاتدارە بەناو موسڵمانەكانیش ئەو حاڵەتەیان پێخۆش بوو تا زیاتر میللەت دەستەمۆ بێت و ئەوانیش لەدزی و گەندەڵی خۆیاندا بەردەوام بن .

زانایانی دەرباری پاشاكان بەناوی گوێڕایەڵی وەلی ئەمرەوە ئەوەندەی تر میللەتیان ژێردەستە كرد ، لەولاشەوە كاربەدەستان تا بینەقاقایان نقوم بوو لە خیانەت وبەدرەوشتی ودزی و ستەمكاریدا .

جائەوەی ئەمڕۆ دەیبینین لە سعودیەو كەنداو و وڵاتەكانی تردا لە دووشمشێرو دارخورماكەی سعودیەدا دەخوێنرێتەوە ،وەك بەو خەڵكە بڵێن :خورماكەتان بخۆن و هەرچی دەمبكاتەوە بەشمشێر لەگەردنی ئەدەین .

سودەیس زاوای شا عەبدوڵایەو دەرەجەی وەزیری هەیە خۆ خوا نەیگرتووە لە خۆی تێكبدات !!ئەوانی تریش هەریەك بەپاساوێك ماستاو ساردەكاتەوە بۆ وەلی ئەمر.دیارەكەسانی زانای خواناس هەیە دژایەتی دەكرێن و تەنانەت زۆریشیان لە بەندیخانەدان .

مەزهەبی بەناو سەلەفی و مەدخەلیەتیش بۆیە حكومەتی سعودی خزمەتی دەكات چونكە بەناوی دینەوە عەقڵی خەڵكیان بۆ دائەخەن و لەبەرئەوەی وەلی ئەمرن هەردەم ئەبێت سڵاوات بدەن لەدیاریان ..

دکتۆر تاریق سوەیدان بەڕێوەبەری کەناڵی ریسالە بوو لەبەرلەوەی عەقڵی دانەخست لایان بردو هەندێ بەناوزانای عەقڵ پووتی سعودیش فەتوای خراپیان دەرکرد لەدژی !هەموو تاوانەکەشی ئەوەبوو کە وتی : ئیسلام هەرگیز قایل نابێ بەستەمی وەلی ئەمرو خەڵکینە ئێوەش لەکاربەدەستانتان بپرسنەوە کە ئەو هەموو ملیار دۆلارە بۆکوێ دەبەن .

شایانی باسە ئەو فەرموودەیەی کەسەلەفیەکان بەنموونە دەیهێننەوە مورسەلەو سەنەدەکەی بچڕانی تیایە هەرچەند لەصحیح موسلیمیشدا هاتووە ، کەدەڵێت : بەگوێی وەلی ئەمر بکە تەنانەت ئەگەر قامچی لە پشتت بدات وماڵیشت بخوات !

**ئیمامی مەعصومی مەدخەلی :**

مەدخەلیەکان لێیان شێواوەو بەرنامەی موخابەراتی سعودی پیادە دەکەن و سەیرەکەش لەوەدایە تەنها خۆیان بەڕاست دەزانن ، شێخ رەبیعیان لێبووە بە ئیمامی مەعصومی شیعەکان ومەلاعەبدوللەتیف بەقوتابیەکانی دەڵێت : ئەگەر سەدان زانا بڵێن شێخ رەبیع هەڵەیە نابێت گوێیان بۆ بگرن و هەردەبێ شوێن قسەی ئەو بکەون( دیارە دەنگی دەهۆڵ لەدوور خۆشە !). لەکاتێکدا هەزاران زانا مەدخەلی بەهەڵەدەزانن وەك دکتۆر محمد موسی الشریف کە بانگخوازێکی سعودیە و باشی دەناسێت ودەڵێت:لای ئێمە لە سعودیە زۆر لە دەستەی گەورە زانایان (هیئة کبار العلماء)مەدخەلی وجامیەکان بەگومڕا دەزانن.




# پەیجی هەڵتەکاندنی مەدخەلیەت

## نموونـەیەك لەسـەر عەقلیەتی مەدخەلیەكان

دكتۆر محسن عبدالحمید دەڵێت : لە ئەردەن لە مزگەوتێك نوێژم دەكرد، ئیمامەكە لەویێ نەبوو خەڵكەكە كابرایەكی ئیخوانیان بردە پێشەوە كە پێشنوێژیان بۆ بكات ،كابرایەكی ڕیش درێژی مەدخەلی بەپەلە هات و هاواری كرد ئەوە ئیخوانە با پێشنوێژی نەكات ڕیشی درێژ نیە،(بەمەرجێ ڕیشیشی هێشتبۆوە بەلاَم وەك ئەو ریشی درێژنەبوو )،چەند نوێژ خوێنێك پەلاماریان داو كوتایان ،كە نوێژەكە تەواو بوو چوومە لای وتم : برام ئەوەی دەویست لەسەر ڕیش لەم مزگەوتەدا ئەم بەزمەت نایەوە، ئەترسم وابزانیت ڕیشی پێغەمبەر (د.خ) وەك ڕیشی تۆ بووە ؟؟ برام ڕیشی پێغەمبەر(د.خ) ئەوەندە بوو بەدەستی دەگیراو وەك ئێوە درێژی نەدەكردەوە !!

## دژایەتی رابـوونی ئیسـلامی

لەبەر دژایەتی ئیخوان بوو كە مەدخەلیەكانیان دروست كرد كەسەری زمان و بنی زمانیان كافركردنی سەید قوتب و ئیخوانە،حوسنی نامووبارەك وخائینی حەرەمەین وەلی ئەمریانە و مورسیش كە حافزی قورئانە و بەشەرعی هاتۆتە سەردەسەلاَت وەلی ئەمر نییە !!(سوپاس بۆخوا ئێستا دەیان كەسی ناوداریان وەك دكتۆر وەدیع فەتحی كەیەكێكە لەدامەزرێنەرانی حیزبی نورر لەئەسكەندەریە وازی لێهێنان و حیزبی نووری شەرمەزار كرد).

## بەناو سەلەفیەكانی میسر

پاش ئەوەی كە حیزبایەتی كردن حەرام بوو بەلای سەلەفیەكانەوە، بۆ مونافەسەی ئیخوان لە سەرەتای شۆڕشەكەی میسردا بە فەرمانی رەبیع مەدخەلی پیاوی موخابەراتی سعودی حیزبی نوریان دروستكرد،چیان بۆكراكردیان و لە پشتەوە خەنجەریان دا لە مورسی و پرۆژەی ئیسلامیان

پەکخست،ئێستاش کە عەلمانیەکان و عەسکەر حسابیان بۆناکەن لە دەمدرێژی و خۆ گوناهبارکردن ناوەستن ،ئەوەتا دەستور دەگۆڕن بەجۆرێك کە لە بەرژەوەندی ئیسلام نیە و زۆر لە عیلمانیەکانیش داوادەکەن کە لە کەرنەڤالێکی گەورەدا لەچك و حیجاب بسوتێنن،کەچی عەلی حاتەمی وتەبێژیان دەستخۆشی دەکات لە کودەتاچیەکان کە ڕێکخراوی ئیخوانیان یاساغ کردو موڵك و ماڵیانیان داگیر کردن،نەك هەرئەوەندە بەڵکو داواش دەکەن کەڕێکگری لە ڕێکخراوی جیهانی ئیخوانیش بکرێ کە لە لە ئەستەنبوڵ و شاری لاهوری پاکستانی کۆبوونەوەیان کردووە بۆتاوتوێکردنی ئالیەتی رووبەڕووبوونەوەی کودەتاچیەکان.

جا ئەپرسم ئەمانەبۆ ئاوا دژی ئیخوانن،ئایاهەقی موسڵمان لەسەر موسڵمان ئەوەنیە کەپشتی بگرێت ؟؟ ئەڵێی چی لەگەڵ ئەو بیروبۆچوونە سەقەتەدا کە بەناوی سەلەفیەتەوە موخابەراتی سعودی دژایەتی رابوونی ئیسلامی دەکات لە دنیادا و ئەو داماوانەش زۆریان وەزانن دینداری دەکەن و کەس موسڵمان نیە خۆیان نەبێ،خوایە هەزاران جار سوپاس بۆ تۆ کە وەك ئەوانە بیرناکەینەوە.

دڵنیام خوێنی گەشی شەهیدان لە میسرو دوعاونزای ستەملێکراوان لە پێش هەموالدا رووی مەدخەلیەکانی پێ رەش دەبێت. (سوپاس بۆ خوا دوعای مەزڵومان گیرابوو ، ئێستا زۆر وتاربێژی مەدخەلی لاهێڵن وتاربدەن و بەرەسمی خستویانەتە خانەی لیرهابەوە).

## دۆستی نەفام

کورد دەڵێت : دوژمنیشت عاقڵ بێت باشە !کابرایەکی راوچی بێچووە ورچێکی هەبوو بەخێوی دەکردو هووبوونە هاوەڵ،رۆژێك راوچیەکە پشوویەکی داو سەرخەوێکی شکاند لە دارستانێکدا،ورچەگیانیش پاسەوانی بوو،مێشێك بەسەری کابراوە نیشتەوە،ورچەکە بەردێکی هەڵگرت ویستی مێشەکەی لێدەرکات سەری پانکردەوە.

ئەمە کتومت حاڵی ئیخوان وحیزبی سەلەفی نوورو ئەزهەرە،خۆم گوێم لێبوو کە کودەتاکەیان کرد سەرۆکی نوور وتی: لەمەمان لەبەرژەوەندی خۆمان و ئیخوان و گەلی میسردا کردووە،بەردەکەیەو نەزان هەڵی گرتووە،نەك هەر سەری ئیخوان بەڵکو واسەری خۆشیان و پاشان ئیسلامیشیان پان کردەوە رەنگە باقیشیان بوێت.

**کۆتایی ٢٠١٤ وانەی پەروەردەی ئیسلامی لە قوتابخانەکان لابراو ، تەنانەت جەماعەتی نووریش دژایەتی دەکرێن و تۆمەتی تیرۆر دەدرێتە پاڵیان لەگەڵ ئەوەدا کە بەرنامەی پێشبڕکێی سەمای شەرقی لە کەناڵی القاهرە والناس دەوە پەخش دەکرێت لەگەڵ سەدان بێحورمەتی تر دژی دین و ئەمانیش نوتق نادەن .**

**.وە سیەتەکەی خۆشەویستمان !!**

حەسون موفتی بەشار ئەسەد کەدەنگی دا بە بەشاری خوێن رێژ وتی : من کەدەنگم داوە بە بەشار وەسیەتەکەی خۆشەویستم جێ بەجێ کردووە کەفەرمانی داوە لەگەڵ سەربازانی شامدا بین .ئەمە لەکاتێکدا کوڕەکەی

بەدەستی جەندرمەکانی دەسەڵات کوژراوەو ژنەکەشی لەداخی ئەو مەوقیفە نامەردانەیەی لێی جیابۆتەوە ، توخوا ئەگەر ئەم برادارە زەرەرمەندی دونیاو ئاخیرەت نەبێت ئەی چیە ؟؟

بەڕاستی ئەوەیە بیروبۆچوونی مەدخەلیەکان وەلی ئەمرێکی خۆسەپێن هەرچیت لێبکات بەهانەی بۆ بهێنیتەوە ، جابۆیە دینداری بە ریش و عەمامەو دکتۆرانیە ، چونکە خوا تاقیکردنەوە دەکات و زۆرکەسی بەناودیندار تیایا دەرناچێت ، خوا بەخۆشەویست دەفەرموێت ، هەرچیم تاقیکردەوە تۆ هیچت بۆناکریت لەگەڵیاو ناتوانی لەوە رزگاری بکەیت( ومن يريد الله فتنته فلن تملك له من الله شيئا ).مائیدە/ ٤١..

ئێوەی بەڕێز وردبنەوە هەمیشە ئەوانەی لەدەربارو دەوری خوانی وەلی ئەمر کۆبوونەتەوە ژمارەیەکی کەمن و لەسەدا نەوەدو هەشتی ئوممەت دژی ستەم و ستەمکارانن هەرچەند دەهۆڵ و زوورنای دەسەڵاتیش چاووگوێ بخەڵەتێنێ و وابزانن زۆرن .

جا عەرەب دەڵێ : هەمووان ئیدیعای خۆشەویستی لەیلا دەکەن و لەیلاش ئیعتیراف بەهیچیان ناکات .خوایە بەهەموو ناوەکانت لێت دەپاڕێینەوە ئیسلامەتیەکەمان لێنەشێوێت و موسڵمانانمان هەمووی خۆش بوێت و کاروکردەوەمان نەسوتێت و بەدەستی بەتاڵ و بە مایەپووچی نەگەڕێینەوە بەربارەگاکەت .

## جەنابی سەرۆك فریاكەوە !

شۆڕشگێڕی بەناوبانگ چیڤارا دەڵێت : راپەڕین دژی ستەمكار پەیوەندی بە ئاینەكانەوە نیە ( هەرچەند ئاینەكانیش دژی ستەمن ) ، لە فیترەتی هەموو مرۆڤێكدا خوا دایناوە كە زوڵم و ستەمی قبوڵ نەبێت ،مەگەر ئەو مرۆڤە خۆی لێهەڵە بكات لەبەرهەرهۆیەك بێت ..

جائەوەی جێی شانازی كوردە نزیكەی سەدەیەكە هەر لەزەمانی شێخ سەعیدی پیران و قازی موحەممەدو بارزانی رەحمەتی و شۆڕشی نوێش بەهەموو كەمو كوڕیەكانیانەوە ئەوەیە كە ملیان بۆ ستەمكار نەداوەو بەردەوام قوربانیان داوە بۆ دوارۆژێكی باشتر بۆ ئەم میللەتە .

ئەمڕۆ لە كوردوستاندا مەدخەلیەكانی بەچكە موخابەراتی سعودی فیكرێك بلاْودەكەنەوە كە هەركەس لەسەردەسەلاْت بوو وەلی ئەمرەو ئەگەر ماڵت بخواو تەعدای شەرەف و ناموسیشت لێبكات نابێت لەروویدا بوەستیتەوە ، جا بەم تەرازووە سەقەتە (كەئەوان بە فەموودەی دەزانن و فەرموودەش نیە) ، كەواتە هەمووستەمكارەكانی یەك لەدوای یەكی عێراق و ئێران و ولاْتانی تریش كەكورد شۆڕشی كردووە بەرامبەریان وەلی ئەمر بوون و كورد خەواریج بووە ، بەوەش بێت كەواتە هەموو خەباتی كوردو ئەو هەموو قوربانیەی دراوە بۆ زبڵدانی مێژوو ،

من نازانم هیچ كوردێكی بەشەرەف ئەوەی قبوڵە ، دیارە نەخێر ، بۆیە داوا لە سەرۆكی هەرێم دەكەم كەسنوورێك بۆ ئەو گاڵتەجاڕیە دابنێن ، راستە ئەوانە بۆ دژایەتی لایەنە ئیسلامیەكان قەڵەو دەكرێن بەلاْم

لەراستیدا ئەوانە یەکەم دوژمنی خۆتان وخەباتی باووباپیرانتانن ئەگەر بەخۆتان بزانن .

## خوایە بەرچاومان روون بکەیت ..




ئەم گەنجە جاسم محمد مخلف لەکوەیت ئاهەنگی هاوسەرگیریەکەی خستە ٢٠١٤/٤/٤ تا شیعاری رابیعەی عەدەوی لەجیاتی چوارەکان دابنێت وەك هاوسۆزیەك بۆ برا میسریە موسڵمانەکان کە ستەمیان لێکراوە ، لەم لاشەوە یاسر بورهامی مەدخەلی میسری پیاوی موخابەرات وخزمەتکاری جوولەکە کە بە باینجانی گەرم ناوچەوانی خۆی سوتاندووە گوایە لەسوجدەدا رەش بووە دەڵێت : وەفدێکی حیزبی نووردەنێرین بۆلای سیسی خوێن رێژ تا گفتوگۆ بکەین بۆ هەڵبژاردنی !! ئاخر زانا سعودیەکە ناهەقێتی کەئەڵێ ئێوەی مەدخەلی لەبلعام بن باعورای جوولەکە خراپترن کەخوا نموونەی بەسەگ دێنێتەوە ؟؟



مەدخەلیەکانی میسرو دونیا ئابڕویان چوو بۆیە **دکتۆر وەدیع ئەحمەد** کە کاتی خۆی قەشە بوو موسڵمان بوو چەند پەڕاوی هەیەو دامەزرێنەری حیزبی نووری مەدخەلی بەناو سەلەفی بوو وازی لێهێنان و وتی : دژایەتی کردنی ئیخوان خزمەتە بەدوژمنانی ئیسلام و ئیخوان کۆمەڵێکی خواناسی باشی لێهاتوون.



## خوا هەقی خوێنی میسرییەکانی سەند!!

ئاشکرایە خوا تۆڵەسێنە ، سەیرکەن ئەوانەی لەبەرەی ستەمدا بوون ، وەك ئیمارات و زاحی خەلفان کەویستیان هەمان سیناریۆی میسر لە تورکیا دووبارەبکەنەوە خوا حەیای بردن بەوەی کە ئەمیرەکانی ئیمارات و زاحی خلفانیش فەزح بوون کەچووبوون بۆ تورکیا بۆ زیناکردن ، جا ئەوەی خۆشە زاحی لابرا لەپۆستەکەی کەلەدوای ئەمیرەوە دەسەڵاتی هەبوو، لە پەیجەکەیدا دوعا لە ئیخوان دەکات ، ئاخۆ خوا دوعای داوێن پیسێکی تاوانباری وەك ئەو بەرامبەر ئەولیاکانی خوا لەسەدەی بیستدا قبوڵ بکات ؟؟

ناوبراو دەڵێت : رووخانی سیسی لەمیسر رووخانی وڵاتانی کەنداوی لێدەکەوێتەوەو دەڵێت : سەرکەوتنی ئەردۆگان کاریسەی سیاسیە ..

خوا ستەم قبوڵ ناکات ، ئەوا بۆ یەکەم جار چوارکچەکەی مەلیك عەبدوڵا بەسکایپی موقابەلەی کەناڵی چواری بەریتانیان کردو لە موقابەلەکەدا دەڵێن کە هەوڵ ئەدەن بۆ مافی مرۆڤ لە سعودیەداو لەبەرئەوەش باوکیان چەند ساڵە دەست بەسەری کردوون لە کۆشکەکانی پاشایەتیدا لە ریازو تینوو برسیان دەکات و نایەڵێت شوو بکەن و کەس سەردانیان بکات ، دایکیشیانی تەڵاقداوە کەناوی ئەمیرە عەنودەو لەبەریتانیا دەژی و لەسعودیە هەڵاتووە.

کەناڵەکە چاوپێکەوتن دەکات لەگەڵ دایکیانداو ئەڵێت: هەستت چۆنە کە کچەکانت ئاوا لێدەکرێت و ئایا ناگەڕێتەوە سعودیە؟؟ ، ئەویش دەڵێت : زۆر ئازارم دەدات حاڵیان، مەلیك دەیەوێت وردە وردە لەناویان بەرێت ومنیش بچمەوە دەست بەسەرم دەکات .بەلاّم نهێنیەکی گرنگم لایە لەسەریان گەر فشارم بۆ بهێنن ئەیدرکێنم .

مەلیك عەبدولاّ سی ژنی هێناوەو چل منالّی هەیە ، کچەکانی دەڵێن: ئەمەحاڵی ئێمە بێت ئەبێ حاڵی میللەت چۆن بێت ؟؟

بەڕاستی ئەم چاوپێکەوتنە لەگەڵ ئەو کەناڵە بەریتانیەدا دەبێتە مەسەلەیەکی جیهانی گەورەو حەیاو ناموسی حکومەتی سعودی چوو ، بەڕاستی من قەناعەتی تەواوم هەیە ئەوەی لەئیخوان بکەوێت بەدەردی عبدالناصرو ناموبارەك و ئیمارات و سعودیە ئەچێت .ئنجا تێدەگەین کە حکومەتی سعودیە شینی چی دەکات ، تا دوا پلە ستەمکارەو لایەکی سعودیەش ئیخوانە بۆیە ئاوا دژایەتیان دەکات .

حجوری زانایەکی یەمەنی سەلەفیە دەڵێت : رەبیع مەدخەلی و زاواکەی پیاوی موخابەراتی سعودین و ویستیان بە ملیۆن دۆلارەکانیان بمانکەنە پیاوی موخابەرات وملمان بۆ نەدان .

ئەوەی خەفەتم ئەداتێ ئەوانەی لای خۆمانن گەورەکەیان دەڵێت: سعودیە قورئان پەیڕەو دەکات بۆیە ئاوا لە خۆشی و رەفاهیەتدان؟؟اوا خوا

ئابرووی بردن سابەڵکو ئەوانەی لای خۆشمان هۆشیان بێتەوە ، تۆ بڵێی ئەم کوردە نەگبەتە خێر نەدیوە رزگاری بێت لەدەم و زمانیان ؟؟

**وەلی ئەمری عەیار(٢٤):**

ئەوەی کە رووئەدات لە غەزەدا لەکاولکاری ورشتنی خوێنی زیاتر لەهەشت سەد کەس و بریندارکردنی هەزاران کەس لەبەرچاوی عالەمدا وا لە ژێرسەری وەلی ئەمری عەیار (٢٤) ی مەدخەلیەکان ، واتە: خزمەتکاری هەردوو حەرەمی پیرۆز ، پێشتر باسم کرد کە شا عەولاّ سی ژنی هێناوەو چل منالّی هەیەو هەندێ لەکچەکانی خۆی دەستبەسەرکردووە کەوتوویانە ستەم مەکە لەخەڵکی .

ئەم وەلی ئەمرە بەملیارەها دۆلاری قوتی موسڵمانانی بەهەدەرداوە بۆ هاوکاری ئیسرائیل و لەگەڵ ئیماراتدا بوونەتە بەرەیەك دژی غەززەو ئیخوان و تورکیاو قەتەرو لیبیاو تونس و...هتد.ئەوەتا نووسەری بەریتانی دیفید هیرست بەڕێوەبەری پێگەی چاوی رۆژهەڵاتی ناوڕاست بەئاشکرا باسی ئەو مەسەلەیە دەکات و بەرپرسە جوولەکەکانیش بەئاشکرا باسی لێوە دەکەن .

جا پرسیارەکەی من ئەوەیە هەتا کەی مەدخەلیە ناحاڵیەکان شوێن وەلی ئەمرە جوانەکەیان دەکەون و ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دابنێن بەهەڵەی خۆیانداو حاشا بکەن لەو وەلی ئەمرەی نەك ئاڵتون بگرە

تەنەکەیەکی رزیویش نیە !!جاهەرکەس رازی بێت بەوحاڵەی دەگوزەرێت بێگومان ئەبێتە شەریکی ئەو تاوانەو لەگەڵ وەلی ئەمرەکەیدا حەشردەکرێ.

لەمزگەوتی بەختیاری هەولێر کابرایەك دێتەلای دکتۆر عوسمان و کێشەیەکی هەیە ، دەزانن کێشەکەی چیە؟؟ مەدخەلیەك پێی وتووە ، کەنانت خوارد ئەبێ بڵێی (بسم الله )ئەگەر وتت : (بسم الله الرحمان الرحیم ) ئەوا بوویتە بیدعەچی !! بیدعەچیش دیارە حوکمەکەی دۆزەخە!!

ئەوە بەبیدعە دەزانێ کەچی چاویان وەلی ئەمرەکەیان نابینێ و گوێیان ئاهو ناڵەی سەدان هەزار فەلەستینی نابیستێ کە بەم رەمەزانە چییان پێدەکرێ!لاحول ولاقوە الا بالله...

## مەدخەلیەکانی قەدیم زەمان!

حەرمەلە کوڕی یەحیا دەڵێت :گوێم لە شافیعی بوو دەیوت: ئیبن عجلان رەخنەی لە والی مەدینە گرت دەرقاچی پۆشاکەکەی درێژ بوو لە نوێژی جومعە و خەڵك بینویانە، والیش بەوە توڕە بوو،فەرمانی کرد کە بیگرن،بەلام دواتر "ئیبن ئەبی زیئب" چووە لای والی و داوای لی کرد لە ابن عجلان خۆش بێت ئەویش لیی خۆش بوو،پاشان ئیبن ئەبی زیئب بە والی وت:ئیبن عجلان گەمژەیە دەت بینیت شتی حەرام دەخۆیت و پۆشاکی حەرام دەپۆشیت،ئەو خراپە و ئەو خراپە دەکەیت قسە ناکات

کەچی یەت لەوە رەخنەت لیٚ دەگریٚت کە پۆشاکەکەت دریٚژەائیتر والیش ئیبن عجلانی ئازاد کرد! ئیستا دنیا پڕ بووە لە ابن عجلان ومەدخەلیەکانی سەردەم هەمان دەوردەبینن!

**مەدخەلیەکان:**

أبوبکر کاروانی دەڵیٚت :لەم ماوەی پیٚشودا رۆژنامەنووسی بەناوبانگی ئەمریکی (تۆماس فریدمان) سەردانی هەریٚم و سلیٚمانی کردو، دیداریٚکی دووقۆڵیمان بوو، لیٚی پرسیم: داخۆ سەلەفیگەرایی لاتان بوونی هەیە؟ وتم : بەڵیٚ.

وتی: کیٚ پشتیوانیان لیٚ دەکات؟

وتم : دووپارتە فەرمانڕەواکەی کوردستان( یەکیتی و پارتی).

وتی : ماقوڵە حزبی عەلمانی پشتیوانی لە سەلەفیەت بکات؟

وتم : بەڵیٚ، لای ئیٚمە ماقوڵە چونکە ناوەرۆکی عەلمانیەت لە وڵاتەکەی مندا لەگەڵ ناوەرۆکی لە وڵاتەکەی تۆدا جیاوازە . لە وڵاتەکەی تۆدا عەلمانیەت تا رادەیەکی زۆر ، بیٚلایەنی دەوڵەت بەرامبەر ئاین و مەزهەبەکان دەگەیەنیٚت. بەڵام لە وڵاتەکەی من و خۆرهەڵات بە گشتی زۆر کات یەکسانە بە سود لیٚوەرگرتنی خراپ( استغلال)کردنی ئاین بۆ مەرامی حزبی و سیاسی.

ئەمەی ئەم برادەرانەی ئیٚمەش دەیکەن هەڵەیەکی ستراتیژی یە.چونکە سەلەفیەت بە گشتی ژینگەی سەرهەڵدان و گەشەپیٚدانی توندڕەوی چەکدار وکلتوری خۆکوژی بەهیٚز دەکات. ئەوەی ئیٚستاش بۆ هەندیٚ

مەبەستی حزبی و سیاسی کاتی و کەم بایەخ دەیکەن، لە دوارۆژدا بە خۆیاندا دەتەقێتەوە و بەمەش وڵاتەکەمان و خۆشیان ئازار دەدەن، بۆیە ئەگەر لە ئایندەدا خوانەخواستە هەواڵی هەوڵی خۆکوژی دژ بە هاوڵاتیانی بێ تاوانی ئێمەت بیست هەر لە ئێستاوە بزانە بەرهەمی ئەم فیکر و کلتورەیە. چونکە مرۆڤ پێش ئەوەی ببێتە خۆکوژو توندوتیژی ئیسلامی، مەرجە مەنزومەی فکری سەلەفیگەرایی قبوڵ کردبێت.

لێرەشەوە واباشە نکوڵی لەم پشتیوانیە نەکرێت ، چونکە رەنگدانەوەی جۆراوجۆری هەیە. لە دانیشتنێکدا کە خۆم تیێدا بەشدار بووم ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی حزبێکی فەرمانڕەوا بە راشکاوی وتی :

(ئەرەوەڵڵا ئێمە پشتیوانی لە سەلەفیەکان دەکەین و، کارێکی قۆڕیش دەکەین) هەر ئەم ئەندامە جارێك لە رۆژنامەکەی خۆیدا باسی ئەوەی کردبوو ، کە ئێمە و برا سەلەفیەکانمان ئامانجێکی هاوبەشمان هەیە، ئەویش رووبەڕوو وەستانەوەیە دژ بە ئیسلامی یەکان!!

## خەریتەی خانووەکەمان !!

وەك بانگخوازی جیهانی مامۆستا راشید ئەڵێت : ئێمە بۆ خۆمان لەم بیابانەی ژیاندا بە خەریتەیەکی خۆمان خانوویەکمان بۆ خۆمان دروست کردووەو لە ژێر سەقفەکەیدا کۆبووینەتەوە ، دڵمان پێخۆشەو بەقەدەر بەرەی خۆمان پێمان راکێشاوەو کاردەکەین بۆ ئیسلام، هەرکەس ئێمەو خەریتەی خانووەکەمانی بەدڵ نیە بابڕوات بۆ خۆی خانوویەك بکات و جەماعەتێك دروست بکات بەو شێوەیەی کەخۆی بە باشی دەزانێت ،

ئەرزی خوا فراوانە ، بۆ گەڕ ئەئالێنێتە ئێمەو بە هەر پاساوێك بێت دەیەوێت خانووەکەمان بەسەردا بڕوخێنێت ..باشتر لە جێی ئێمە بینا دەکات؟؟ نە بەخوا بۆی ناکرێت ، مێژوو شایەتە !

ئیش کراوە ئیتر بەرهەمی چەند دەبێت ئەوە لای خوایە ، بۆنموونە:ناوچەیەکی یەکگرتوو بیردەکەنەوە کە بنکەیەکی فێرکردنی قورئان بکەنەوەو دیارە ئیمکانیاتیش نیە ، ئەمە باسدەکەن ، بەڵێندەرێك خانوویەکی وەرەسەیان هەیە پارەی هەموو بەشەکان ئەدات و بۆ خوا ئەیکات بەوەقف ..

خەمی مامۆستایان دەبێت ، هاوسەری بەڕێوەبەری بنکەکە شەو خەو بە خۆشەویستەوە دەبینێت (د.خ) کە لە بنکەکە دەبێت و مژدەی ئەداتێ کەخەمی مامۆستایان نەبێت..سوپاس بۆخوا هەروا دەرچوو تا ئێستا پەکیان نەکەوتووەو ئەم هاوینە دوروسەد قوتابیان هەبووە ..

مامۆستایەکی یەکگرتوو یەکێ لە قوتابیە کچەکانی کەم پابەندی ئیسلام بوو ، هەندێ نامیلکەی ئیسلامی ئەداتێ ، پاش ماوەیەك بەگریان دێت و سوپاسی ئەو گرنگی پێدانەی دەکات و دەڵێت : مامۆستا من بۆ خوا تەوبەیەکی چاکم کردووەو بزانە چی دەکەم ، ئەو خۆشکە بەرێزە نمرەیەکی باش دێنێت لە پۆلی دوانزەداو لە پێشی هەموو ئیختیاراتەکانەوە شەریعە دەنووسێت ، شەریعە بە یەکەمی تەواو دەکات و ماستەریش دەخوێنێت و ئێستا بانگخوازێکی دیارە لەناوچەکەدا ..

ئەمەو هەزاران نموونەی تر لەسەر رۆڵی ئیسلامیەکان لە کاری خێردا کەزۆر مایەی دڵخۆیەوسوپاس بۆ خوا لەخێردان .

## بەسمان لێبخوێنن لەخوا بترسن !!

مەدخەلیە کان دەڵێن : حیزبایەتی بیدعەیە ، بەیعەتدان واتە پەیماندان بۆکارکردن بۆ ئیسلام بیدعەیە ، ئەگەر لەدڵەوە وەلی ئەمرە فاسقەکانت خۆش ئەوێت ئەوا بیدعەچیت و بیدعەچیش دوور لەڕووتان بەقسەی ئەوان سەگی دۆزەخە.

هەڵوەریوێکیش لەیەککگرتوو ئەڵێت : ئیسلامیەکان هیچیان پێناکرێت ، وەك ئەوەی عیلمانیەکان زۆر جوان خزمەتی میللەتیان کردبێت ، بەو هەموو سەروەت و سامانەی ئەم وڵاتەوە ، کە بوونەتە خاوەنی دەیان ملیار دۆلار لەسەر قوتی ئەو میللەتە ..

لێتان ناشارمەوە ترسم لێنیشتووە ، ئەڵێن نەوت چل ساڵێکی تر دەوام دەکات ، ئەریَ باشە نەوت نەمێنیَ و ئێمە ژێرخانی ئابووریمان بەو وێرانیە ئەم میللەتە داماوە چی چاوەڕێی دەکات بەدەست ئەم حکومەتە بێبەرنامەیەوە ، کەخەریکی گیرفان پڕکردنی خۆیان و ئەندامانیانن .

ئەمڕۆ هەروا حسابێکم کرد هەشتاودووهەزار کەسی حیزبیان بۆ خۆیان خانەنشین کردووە ئەگەر یەکی مانگی هەزار ودووسەد دۆلاریشیان بدەنیَ ئەکاتەزیاتر لە ١٠٠ملیۆن دۆلار مانگانە !!واتە: مانگی سەد قوتابخانەی پێدروست دەکراو سەدان کارگەی پیَ بینادەکرا ..

جا ئەمەدخەلیەکان فزە دەکەن و نە کابرای لەمەڕ خۆمان و هەر بە ئێمە دەوێرن ، خەریکە قدرزاربارمان دەکەن ، نەك هەرئەوە بەڵکو ئەو قوتبی زەمانەیەی کە بە دەم هیچی نەهێشتۆتەوە دوروسەعاتی رەبەق کۆبوونەوەی کردبوو بەتەنها لەگەڵ (...) ..ئەگەر بۆ ئاژاوەگێڕان و دوژمنایەتی ئێمە نەبێت بۆ چیە ؟؟(سبحان الله ئەبێ چەند حەزی کردبێ بە نهێنی بێت و کەس پێی نەزانێت ، خوا سرِی هەڵمالّی ) ..

بەهەرحاڵ حەواڵە بەخوا بن لەو فلیمانەمان زۆر دیوە ، ئێمە هەرگیز نەترساوین و ناشترسین چونکە (اسْتِكْبَارًا فِي الْأَرْضِ وَمَكْرَ السَّيِّئِ وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ فَهَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا سُنَّةَ الْأَوَّلِينَ فَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَحْوِيلًا (٤٣)فاطر) .

## باخوا نەتانگرێت !!

دەسەڵاتە گەندەڵەکان ئەگەر لەبەر کورسیەکانیان دوژمنی ئیخوان بن هەقی خۆیانە بەڵام کاکی مەدخەلی تۆبۆ؟لەکاتێکدا ئیخوان بەهەزاران شەهیدی داوە بۆ خوا ،سی و پێنج هەزارئەندامیان لەمیسردا بەتەنها لەحوکمی نامووبارەکدا ساڵانی بەندکردنیان کۆکردنەوە پانزە هەزار ساڵ بوو!!



## عبدالله المطوع

ئیخوان فیکری میانڕەوی ئیسلامیان بوروژاندەوەو بەملیۆنەها پەڕاویان چاپ کرد ، بەسەدان ملیۆن موسڵمانیشیان هوشیار کردەوەوفێری ئیسلامەتیان کردن ، ئەندامانیان لەکاری خێرخوازی و بەخشیندا سەرمەشقی دنیان و ئیمامی عوسمان سەرقافڵەیانە، ئەمەش تەنها یەك نموونە:

شێخ عبدالله المطوع دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئیسلاحی کوەیتیە،نیو سەدە رابەرو سەرکردەیان بوو، لەسەر چەند وێستگەیەکی ژیانی دەوەستین :

لەساڵی ١٩٢٦ لە کوەیت لەدایك بووە ، لە ١٤ ساڵیەوە بازرگانی کردووە، کەباوو باپیریشی هەر بازرگان بوون .

لەساڵی ١٩٤٦ لەگەڵ عبدالعزیزی برایدا لە مەککەو مەدینە چاویان بە پێشەوا بەننا دەکەوێت و دوو پەڕاوی ئیسلامیان بەدیاری ئەداتێ بەمەش ژیانیان گۆڕا بۆ خوا.

لەساڵی ١٩٥٠دا بەشداربوو بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەی ئیرشاد وەك یەکەم کاری موئەسەسی ئیسلامی لەکوەیتدا ، لەسەرەتای شەستەکانیشدا کۆمەڵەی ئیسلاحی دامەزراند و لەساڵ ١٩٧٦ ەوە تا مردنی لە ٢٠٠٦/٩/٢ سەرۆکایەتی کرد .

ناوبراو زۆر دەوڵەمەندبوو ، لەهەمان کاتدا ئەهلی خێربوو ، لە کۆنفرانسێکدا کە قەرزاوی باسی دامەزراندنی کاری خێرخوازی ئیسلامی کرد ، چرپاندی بەگوێی قەرزاویدا کە یەك ملیۆن دۆلار ئەبەخشێ بەو کارەو یەکێ لە باڵەخانەکانیشی ئەکات بەوەقف بۆ کاری خێرخوازی .

کۆمپانیایەکی بەریتانی مەی دەهێنایە کوەیتەوە و بەئاشکرا دەفرۆشرا گوایە بۆبیانیەکانی کوەیتە ، شێخ عبداللە کەوتە ئیمزا کۆکردنەوەو توانی میری ناچاربکات کە مەی یاساغ بکات و تەنانەت لەفڕۆکەی کوەیتیشدا پێشکەش نەکرێت .بەهەمان شێوەش میری ناچارکرد کەگۆشتی بەراز نەیەتە ناوکوەیتەوەو دەرخواردی خەڵك نەدرێت .

پیاوێکی کوەیتی شانۆیەکی بۆ سەماکردن دروست کرد ، ئەم توانی قەناعەت بە ئەندازیارێك بکات کە لە تەصمیمی ماستەر پلاندا شەقامێکی پیابەرێت ، بەو شێوەیش رزگاریان بوو لەو کارە خراپە .

لەرێی گۆڤاری (المجتمع) ەوە کەزمان حاڵی برایانە ، دژی جەمال عبدالناصری خوێن رێژو حافز ئەسەدی دیکتاتۆر بابەتیان بلاّو دەکردەوە ، بۆیە عبدالناصر ٥ ساڵ سزای زیندانی بۆ دەرکرد غیابیا ئەمە لەکاتێکدا

ناوبراو کوەیتیە ،بەلاَم هیچیان بۆ نەکرا بەرامبەری و ئەمیری کوەیت پشتگیری کرد.

عبدالحلیم خەدامیش بەباڵویزی کوەیتی وت لەسوریا کە شێخ عبداللە دەمی داخا باشە ئەگینا ئاسانە کە دەمکوتی بکەین .دیارە ئەویش بەردەوام بوو لە ئابڕووبردنی بەعس بۆیە پلانیان دانا کە کۆمەڵەی ئیسلاَح بتەقێننەوە، خوا کردی گەنجێکی کوەیتی کەشفی بۆمبەکەی کردو پووچەڵ کرایەوە، کە مولحەقی سەربازی سەفارەتی سووری لەکوەیت دای نابوو، دووجاری تریش هەوڵیان داوە تیرۆری بکەن و خوا پاراستی ، بۆیە ناچاربوو سەیارەیەکی مارسیدیسی گوللە نەبڕی کڕی .

ئەم پیاوە باشە بەو هەموو سەروەت وسامانەوە حەزی لەتەنتەنەو فەنتەنەو زیادە مەسرەف نەبوو ، تەنانەت کچەکەی دەڵێت: جانتایەکی قوتابخانەی تۆزێ گرانم کڕی بوو زۆر دڵم پێی خۆش بوو ، باوکم زۆر لۆمەی کردم بۆئەوەی جیاوازنەبم لەقوتابیەکانی هاوەڵم و ئەوان دڵیان لەخۆیان دانەمێنێت .

ئەوە نموونەی قوتابیەکانی بەنناپە بۆیە هەموو دونیاو خائینی حەرەمەین دوژمنیانەو بەتیرۆریست ناوزەدیان دەکەن، توتیە مەدخەلیەکانیش قسەی ئاغاکانیان دووبارە دەکەنەوە.

ئیخوان هەشتا ساڵ زیاترە خەبات دەکات ئەوە بەرهەمەکەیەتی لەسەرتاسەری دونیادا ، ئادەی مەدخەلیەکان خۆ ئێوە چەند ساڵێکە پەیدابوون چیتان کردووە ، تەنها یەك نموونەم بدەنێ وەك شێخ عبداللە

المطوع و شێخ عبداللە عەزامی شەهید کە خەوو خەیاڵی سۆڤیەتی بەبادا و شێخ ئەحمەد یاسینی شەهید کە جوولەکەی تۆقاندبوو .

لەهەمووی سەیرتر ئەمانە پێنەزانن ، بۆ نموونە کە لەکوردوستانەوە پاش بەزمەکەیان لەگەڵ یەکێتی رایانکرد بۆ سۆدان و، لەناو گەرمای سۆدان چوون بۆ یەمەن ، لەیەمەن وێنەکانی مزگەوتی ئیمانیان لە گۆڤاری جیهادی شێخ عبداللە عەزامدا بڵاودەکردەوەو خەڵك كۆمەکی و پارەیان بۆ ئەناردن ، یان فلانە کەسیان لەیەمەن لە مەدرەسەکانی ئیخواندا چەند ساڵ دەرسی ئەوتەوە بۆ ئەوەی بژی، یان دکتۆر عابد هاشمی ئیخوانی عێراق بوو بوو بەکەفیلی بۆ خوێندنی زانکۆی لەیەمەن.. دیارە وەفا سیفەتی موسڵمانە ، ئێوەی مەدخەلیش خۆتان بە موسڵمان دەزانن ، بۆیە وەفاتان هەبێت و باسی ئیخوان مەکەن باخوا نەتانگرێت !!

## قسەدەکەی هەروەی قسەناکەیت هەروەی (

کاتێك ئەبینی کەسانێك بە لاڕێدا دەبرێن ، ناتوانی قسەنەکەیت، دیارە ئەوەی لەهەق بێدەنگ بێت گوناهبارە (الساکت عن الحق شیطان أخرس )، ئاخر چ ویژدانێك قبوڵ دەکات کوێرێك خەریك بێت بکەوێتە چاڵێکەوەو ئاگاداری نەکەیتەوە.

بەخوا ئەو لاوو تازە پێگەیشتوانەی ئێمە بەدڵێکی سافەوە ڕوودەکەنە مزگەوت ، کاتێك کەسانێك بەناوی سەلەفیەتەوە کەحاشا ئەوانە سەلەفی نین ، رەشبینیان دەکەن و دڵیان پڕدەکەن لەرق و قین بەرامبەر موسڵمانان و لەسەر مەسائیلە خیلافیەکان خەڵکی دەکەنە بیدعەچی ، بەلای منەوە

سەدخۆزگە بەچاڵەکە چونکە ئەوە چاڵێکە هاتنە دەرەوە لێی زەحمەتە و مل شکاندنی قیامەتی تیایە .

شوێنکەوتووانیان فێردەکەن :

عامەی موسڵمانان هەرهیچ ، حیزبە ئیسلامیەکانیش هەموو شلگرتوون و لەدین تەوەلان و بیدعەچین.

قسە و فەتوا بەس لەدکتۆر رەبیع مەدخەلی سعودی جوانە و کەس ناگاتە پلەی ئەو خوابیپارێزێت !!

لەگوگڵ نووسیم وەلامدانەوەی رەبیع مەدخەلی ، چەندەها مەوقیعی عەرەبیم بۆهات کەچۆن زانایان وەلامی ئەو بەناو زانایەیان داوەتەوە، زۆر خەمم خوارد کوردێکی دۆ نەدیوی داماوی تازە پێگەیشتوو لە کوێوە بچێت بگەرێت و بزانێت رەبیع مەدخەلی یەکێکە وەکو ملیۆنەها زانای ترو زۆر لەبۆچوونەکانی هەڵەن و زانایان وەلامیان داوەتەوە،ئنجا ئێمەی کوردی خێر لەخۆنەدیوی چەند جار ئەنفال کراو بەدەستی عەرەب و کورد خۆشی، چیمان داوە لەوەی دینەکەمان لەکابرایەکی سعودی بیروبۆچوون سەقەت وەربگرین ،بۆ لەسعودیە خۆی چەندکەس دوای کەوتوون تا ئێمە دوای بکەوین ؟

ئەم بەزمە چیە هاوردەیان کردووە بۆمان ؟؟

ئەوەش لینکی پەیجی فەیس بووك ،کە وەلامی مەدخەلی جامیەکان ئەداتەوە ەبەڵگەوەwww.facebook.com/jamiya.madkhila

ئەمەبێجگە لە دەیان پێگەی تری کوردی بۆ ئەوانەی کە عەرەبی نازانن

وەك (ڕێگەی مینبەری مامۆستا سەرباز کە مەلا لەتیف موحاسەبەی کاك وشیار ناوێکی دەروێشی دەکات کەچۆن سەلامی لە مامۆستا سەرباز کردووە کە بیدعەچیەو دژی مەنهەجە سەقەتەکەیانە ، هەروەها پەیجی هەڵتەکاندنی مەدخەلیەت و ناسینی مەدخەلیەکان و ئەمەبێجگە لەدەیەها پەڕاو بەکوردی و بەعەرەبی کە تۆزی مەدخەلیەکانی داوە بەبادا ..

جا ئەوەی کە ئاگای لەم بەزم و بازاڕەیە قسە دەکات هەروەی قسەناکات هەروەی .

## مەدخەلیەکان بناسن

دکتۆر محمد سعید رەمەزان البوطی یەکێکە لەو زانا گەورانەی کە بەرپەرچی بەناو سەلەفیەتی داوەتەوە و کتێبی (اللامذهبية أخطر بدعة تهدد الشريعة الاسلامية)دەرکرد کە باسی ئەوە دەکات وازهێنان لە چوار مەزهەبەکە بەحوجەتی ئەوەی لەقورئان و سوننەوە یەکسەر حوکمەکان وەرگیرێ وەك سەلەفیەکان دەڵێن ، ئەوە ترسناکترین بیدعەیە کە هەڕەشە لەشەریعەت دەکات .

هەروەها کتێبی (السلفية مرحلة زمنية مباركة لامذهب اسلامی ) لەم کتێبەشدا جەخت دەکاتە سەرئەوەی کە ئەم سەلەفیەتە هەندێ هۆکاربوونە هۆی دروست بوونی لەزەمانی محمد عەبدەو جەمالودینی ئەفغانی لەمیسرو هەروەها لای محمدی کوڕی عبدالوهاب لە جەزیرەی عەرەبی ، جا ئەم سەلەفیەتە بیدعەیەکی تازەیە هاتۆتە کایەوە ، چونکە سەلەفیەت مەرحەلەیەکی زەمەنی موبارەکە نەك مەنهەجێکی تایبەت .

دکتۆر دەڵێت : ساڵی ١٤٠٦ کۆچی واتە ٢٩ ساڵ لەمەوبەر لە کۆنفرانسی رۆشنبیری رابیتەی عالەمی ئیسلامیدا بەشداریم کرد، زۆر لەمیوانەکانیش لە ئەمریکاو ئەورووپاوە هاتبوون ، پاش گفتوگۆکردن دەرکەوت کەهەموویان لە مزگەوت و بنکە ئیسلامیەکاندا گیریان خواردووە بەدەست ئاژاوەی سەلەفیەکانەوە ، تا کارگەیشتبووە ئەوەی لە مزگەوتی واشنتۆن پۆلیسی ئەمریکی تەدەخولی کردبوو وە بۆچەند مانگێکیش مزگەوتەکە داخرا .

سی و یەك ساڵێکیش لەمەوبەر لەمزگەوتێکی فەرەنسا هەمان بەزم روویدابوو ، پۆلیسی فەرەنسی تەدەخولی کردبوو، یەکێ لەلایەنەکانی شەرەکە غیرەت گرتبووی لە پۆلیسێك توورە بوو بوو کە بۆچی بەپێڵاوەوە هاتۆتە ناو مزگەوتەکەوە ، ئەویش فوری یابوو بەدەمیاو وتبووی : جا کێ ئێمەی هێناوەتە ئەم مزگەوتەوە بەم حاڵەوە ، مەگەر ئێوەی سەخیف نین !!(لا ٢٤٥ السلفيه مرحله ...)

هەروەها لەلاپەرە (٢٣٨ السلفية مرحلة زمنية ..) دەڵێت : لەوڵاتێکی عەرەبی دوای نوێژی شێوان لەگەڵ کۆمەڵێك بانگخوازدا بووم، یەکێك دەستی بەرزکردەوەو کەوتە دوعاکردن و هەمووان ئامینیان بۆدەکرد ، کاتێکمان زانی سەلەفیەك هەستاو چووە ئەولاوە بەحساب لەم بیدعەیەدا بەشدار نەبێت، گوایە خۆشەویست(د.خ) لە دوای نوێژ دوعای نەکردووە .

منیش وتم : برا ئەوەی تۆ رایەکی زانایانەو رای تریش هەیە کە خۆشەویست(د.خ) دوای نوێژ دوعای کردووە ، بۆ ئەبێ تەنها ئەوەی تۆ راست بێت و ئێمە بیدعە چی بین .

ئەوەی داخە لای من کەتەنها مەزهەب و بۆچوونی خۆیان بە راست دەزانن گەنجێکی داماوی مزگەوتیش بەناوی دەرسی عەقیدەوە ئەکەوێتە داویانەوەو وەکو خۆیانی لێدەکەن و چاوی بەکەس هەڵنایەت ، ئیتر ئەو داماوە ئاگای لەو هەموو زانایە نیە کە ڕەدی ئەو بەناوسەلەفیانەیان داوەتەوەو سەلماندویانە کە ئەوانن بیدعەچی راستەقینە ، کێش بڕوا ناکات باتۆزێ زەحمەتی خۆی بدات ئەو دووکتێبە بخوێنێتەوە کەباسمان کرد یان ئەو کتێبەکوردیانەی کە رەدی مەدخەلی و بەناو سەلەفیەکان ئەدەنەوە چاوێکی پیابخشێنێت.

## کتێبێکی ناوازە

لەم رۆژانەدا کتێبێکم خوێندەوە بەناوی(البدعة وأثره في اضطراب الفتاوى المعاصرة ) کە دکتۆر(عبدالاله العرفج) نووسیویەتی کە خەڵکی سعودیەیە .

ناوبراو دەڵێت : لەساڵی ١٤٢٨ ی کۆچی واتەحەوت ساڵ لەمەوبەر وتاربێژێك لە وتاری هەینیدا لەبارەی یادی مەلودەوە کەرای جیاوازی لەسەرە وتی : *(ئەوانەی یادی مەولود دەکەنەوە گوناهبارترن لەوانەی کە مەی دەخۆنەوەو زینادەکەن و پیاودەکوژن ودزی دەکەن*

، *وه دەبێ کاربەدەستان رێ لەمەبگرن )*..وه ئەم ئایەتەشی خوێندەوە {وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاء مَّنثُوراً } الفرقان٢٣ .

ئەمە وای لێکردم کە ئەو کتێبە بنووسم بەراستی هەندێ کەس زیادشوولّی لێهەڵدەکێشن و تەنها بۆچوون و مەزهەبێك بەراست دەزانن کە چەند مەزهەب و بۆ چوونی تری زانایان هەیەوخەڵکانێکی زۆر شوێنی کەوتوون و مەرج نیە ئەوانە بەتەنها راست بن .

ئنجا هەندێ وتاربێژو بەناو سەلەفی ئایەتێ کە بۆ سزای کافر دابەزیوە ئەیدەن بەسەرموسڵماندا کە ئەمەش نابێت ، وەك ئەو ئایەتەی کەباسمان کرد . (لا ٢٢).

خاڵێکی تری زۆرگرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە کەبەداخەوە زۆر کەس نایزانێت ، ئەو زانایانەی کەسەلەفیەکان شتیان لێوەردەگرن بۆ خۆیان هاوڕانین لەسەر ئەو مەسەلانەی کە بەم رۆژگارە ئەو عالەمەیان پێوە سەرقاڵکردووە، بۆنموونە :

| | بابەت | بیدعەیەو نابێت | جائیزەو بیدعەنیە |
|---|---|---|---|
| | تەعزیە | ئەلبانی و فۆزان | ئیبن باز و ئیبن جبرین |
| | پیرۆزبایی ساڵی کۆچی | فۆزان | ئیبن بازو ئیبن عسێمین |
| | سەردانی گۆڕستان لە | ئیبن بازو فۆزان | ئیبن جبرین |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | جومعەدا | | |
| | قورئان خوێندن لەسەر مصحف لە نوێژدا | ئەلبانی | ئیبن بازو فۆزان و ئیبن جبرین |
| | دوعای خەتمی قورئان لە نوێژدا | ئەلبانی و بەکر بن زەید | ئیبن باز و فۆزان و ئیبن جبرین |
| | ماچکردنی قورئان | ئەلبانی | ئیبن بازو فۆزان |
| | ریش بەردانەوەو لێنەگرتنی | ئەلبانی | ئیبن بازو فۆزان |

## راوکردنی بانگخوازان!!

محمد مەدخەلی کە موفتی مزگەوتی مەدینەیەو برای رەبیع مەدخەلی شێخی مەدخەلیەکانە،دەڵێ:ئیمامی هەموو سەلەفیەکان شا عەبدولڵایە !!

جائەم شا عەبدولڵایە بەفەرمانی مام ئەمریکاو خاڵە ئیسرائیلیان کەوتوونەتە راوی بانگخوازان ، شێخ وەجدی غەزاوی بەڕێوەبەری کەناڵی (الفجر) ی قورئان گیراو دوانزە ساڵ حوکم درا ، لەبەرئەوەی لەبەرنامەیەکی سی ئەڵقەیی رەمەزاندا بەناوی (فضفضة) گەندەڵیەکانی ئال سعودی کەشف کرد .

ناوبراو دەڵێت : چوومە کۆشکی شاهانە مزگەوتێکی تیابوو ، نوێژی هەینیم کردو دەسەڵاتدارانیش ئامادەبوون ، کابرای وتاربێژی داماو باسی شەونوێژی دەکردو دەگریا ، منیش لەدڵەوە پێکەنینم بەعەقڵی دەهات ، ئاخر کابرا باسی شەونوێژ بۆکێ دەکەیت ؟؟ ئاخر ئەمانە هەرچی خوا پێی ناخۆش بێت ئەیکەن!!

هەروەها ئەوەی لەفەیس بوك نیشانەی رابیعە دانێت ودەستیان بیگاتێ لە بەندیخانە لەسەر ئەو تاوانە گەورەیە بەندی ئەکەن !

هەروەها هەواڵەکان دەڵێن کە سعودیە بە فڕۆکەی تایبەت چەك دەنێرێت بۆ عەلمانیەکانی لیبیا بۆ دژایەتی ئیسلام ..

دیارە ئیماراتیش لەسەر هەمان مەزهەبەو زۆر تەنگەتاو بوون کە شێخ قەرزاوی لەقەتەرەوە لەوتاری هەینیدا وتی : ئەم کارانەی ئیمارات دەڕژێتە خانەی دژایەتی ئیسلامەوە .(وێنەی وەجدی غەزاوی)



## قالبێکی سەقەت

گەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەت کەس لاری لێ نیە ، بەڵام قالبی مەدخەلیەت بەناوی گەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەت قالبێکی سەقەت و عەیبداریە !!

ئەمانە بەگەزو مەنی خۆیان هەموو شتێك پێوانەدەکەن و ئەوەی مۆری مەدخەلی بەناوچەوانیەوە نەبێت ، ئەگەر ناوچەوانیشی توێخی رۆیشتبێت لە سوجدەدا بە بیدعەچی دەزانن.

ئەم مەدخەلیانە چەند سیفەتێکیان هەیە کەپێی دەناسرێنەوە :

١-ئاژاوەنانەوەوتەبدیع کردنی هەموو موسڵمانان و هەموو زانایان تەنها ئەوانە نەبێت کە هاوبیریانن .شێخ ئیسحاق جوەینی کەزانایەکی سەلەفی راستەقینەیە لەمیسردەڵێت : دوای نوێژی بەیانی تەلەفونیان بۆکردم لەشارێکی کەنەداوە کەتاقە مزگەوتێکیان هەیە مەدخەلیەکان دەستیان گەیاندویەتیێ و ئاژاوەیەکی گەورەیان ناوەتەوە، دوای ئەو زانایە بکەون و دوای ئەو مەکەون و لەدوای ئەوەوە نوێژمەکەن ، ئیتر لەم بەزم بازارە ، بۆیە دوعادەکات و دەڵێت : خوایە زەوی لەم ئاژاوەچیانە پاك بکەرەوە .

٢-ئەوی بەدڵیان نەبێت ناووناتۆرەی شوێندەخەن ، بۆنموونە بیست ساڵ لەمەوبەر نەگبەتێکیان لەسلێمانی بەمزگەوتی خانەقای سولەیمانی دەوت : خانەگا لەبەر ئەوەی قەبری تیایە !!

برادەرێك بەناوی محمد دەمی سوتاو شتێكی لەسەر یەكێكیان بلاو كردەوە لەوەلامدا پێی دەڵێت : ئەوە محمد نیە موزەممەم(زەمكراو نەك سوپاس كراو) كەئەمەش ناوو ناتۆرەی كافرەكان بوو بۆ پێغەمبەر(د.خ) كاتی خۆی .

دكتۆر عبدالكريم زيدان ،كەبەدەیان كتێبی هەیەو زانایەكە لەجیهانی ئیسلامیدا بەناوبانگەو تا رۆژێك پێش وەفاتی لە كۆلێژی شەریعەت دەرسی وتۆتەوەو قوتابی پێگەیاندووە لە عێراق ویەمەن، مەدخەلیەكان پێی دەڵێن : فوەیسق ، واتە فاسقی بچكۆلە ، تەسەور بكەن لەفاسقیشدا گەورەیی نادەنێ وبچوكە بەلایانەوە .

لەمزگەوتی مەدینە زانایەكی مۆریتانی هەیە بەناوی محمد شەنقیتی لەبەرخزمەتی دایكی ژنی نەهێناوەو فراوانترین ئەڵقەی دەرسی هەیە ، چونكە مۆری مەدخەلی بەناوچاویەوەنیە ، بوختانی بۆدەكەن و دەڵێن بۆیە ژن ناهێنێ خەریكی (لواطة) یە.

٣-دوعاكردن و ملكەچی بۆ وەلی ئەمر با فاسق و تاغوتیش بێت ، برادەرێكی زۆر شارەزای لای خۆمان كەئەویش خاوەنی بڕوانامەی بەرزە لەشەریعەتداو لەیەمەن خوێندنی بالای تەواوكردووە مەدخەلیەكی برادەری ئەم بەبیدعەچی و تەكفیری دەزانێ ، ئاخر باشە بۆ ؟؟تومەز بینیویەتی جارێك لەحەرەمی مەكە لەدوعای تەراویحدا دەستی بەرزنەكردۆتەوە دوعا بۆ شای سعودیە بكات !!

ئنجا سیخوڕی دەکەن لەزۆر وڵات بۆ دەسەڵات و زۆر هەوڵ ئەدەن ئەو وتاربێژەی کە بەوان ناخوات بۆی تێبچێنن و نەیەڵن وتاربدات .

٤- تەنها خۆیان بەراست دەزانن لەحەفتاو سێ فیرقەکەو باقی خەڵکی هەموو بیدعەچین .ئەمەش وای کرد برادەرێك لە ناحیەیەکی نزیك سلێمانی دوو کوڕی دەبنە مەدخەلی ،گومانی بۆدروست دەبێت ئاخۆ کێ لەسەرهەق بێت ، هەموومانگی رەمەزانی(٢٠١٣) دوعادەکات خوا هەقی پیشان بدات ، شەوێکیان لەخەویدا دەبینێت خۆی و ئەهلی مزگەوت هەموو روو لەقیبلەن و دووکوڕەکەشی پشتیان لە قیبلەیە !!!



This approach should vary from country to country. For example, in Egypt it would be the Muslim Brotherhood... Again, it is essential that the U.S. hand not be seen.

ترجمة النص

... الصعوبة في تحديد الزعيم أو المجموعة المناسبة التي يمكن دعمها، فالولايات المتحدة يمكن أن تدعم بتعقل اتجاهات سلفية سائدة، مثل مجموعة المدخلي، والتي تؤثر في رفع الدعم عن الجهاديين، ولا تدعو إلى العنف، وذلك من خلال دعم المؤلفات، و المحاضرات والمدارس الحديثة، وهذا سيكون له تأثير في المدى القصير، وهذا أيضا سيعيق تجريد العقيدة ... الإتجاه الذي تهتدي به الحركة الجهادية كثيرا، ويمكن أن تدعم ...

«فالولايات المتحدة يمكن أن تدعم بتعقل اتجاهات سلفية سائدة، مثل مجموعة المدخلي، والتي تؤثر في رفع الدعم عن الجهاديين»

**ئەوەش راپۆرتی بنكەی قەلاچۆكردنی تیرۆری ئەمریكی كە باسی پیلانی موخابەراتی ئەمریكی دەكات كە چۆن دەعمی مەدخەلیەكان بكەن تا خەڵك لە جیهاد ساردبكەنەوە ، :**

**پارچە وەرەقەیەك :**

ئەو پارچە وەرەقەیەی كە بەدەست و خەتی رەبیع مەدخەلی نووسراوەو تەزكیەی مەلا لەتیف دەكات و دەروێشەكانیشی خۆیانی پێوە بائەدەن .

ئاخر ئەبێ رەبیع مەدخەلی خۆی چی بێت و تەزكیەكەی قیمەتی چەندبێ، لە كاتێكدا دكتۆر محمد موسى الشريف كە پێگەی (التأريخ) ی هەیەو بەدەیان كتێبی هەیەو بانگخوازێكی دیارە دەڵێت: لای ئێمە لە سعودیە زۆربەی زانایانی هەیئەی كیباری عولەما مەدخەلی بەگومڕا دەزانن!!

ئێوە رۆژێك دیوتانە دكتۆر مستەفا زەڵمی بە پارچە وەرەقەیەكی زانایەكەوە بنازێت ، یان دكتۆر عەلی قەرەداخی وەرەقەی كەس پیشان بدات ، زانا راستەكان بەهەوڵ و كۆشش و نووسینەكانیان خەڵكی حسابیان بۆدەكەن .



بسم الله الرحمن الرحيم

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

أما بعد فإن الأخ الشيخ الدكتور عبد اللطيف أحمد الكردستاني

من خيرة علماء أهل السنة والدعاة إلى الله

وقد نفع الله به نفعا كثيرا في بلده وذلك بنشر دعوة التوحيد والسنة

كتبه

ربيع بن هادي عمير المدخلي

في شهر ربيع الثاني في الرابع والعشرين من عام ١٤٢٥هـ

**مۆری مەدخەلی:**

سیفەتێکی ئەم مەدخەلیانە زۆر سەیرە شانازی دەکەن بەپارچە وەرەقەیەکەوە کەرەبیع مەدخەلی نووسیویەتی : فلأن زانایەکی باشی ئەهلی سوننەیە وبانگخوازە بۆ تەوحید !!

١-باشە رەبیع مەدخەلی ئەگەر باشیش بێت یەکێکە لە ملیۆنەها زانای جیهانی ئیسلامی و یەکێکە لەهەزاران زاناو دکتۆری سعودی ، ئەگەر پارچە وەرەقەیە بنووسێت یان نا ئەبێ چی بێت ؟؟لەکاتێکدا کەتێبینی لەسەرەو نەك لای خۆمان تەنانەت لەسعودیەش بەهەزاران دکتۆرو زانا هەن ناچنە لای وەرەقەی لێوەرگرن و وەلأمی بۆچوونە سەقەتەکانیان داوەتەوە.

٢- باشە قەت دیوتانە دکتۆر عەلی قەرەداخی و هەزارانی ولأتی خۆمان و ولأتانی دەرەوە وەك دکتۆر تاریق سوەیدان و ئەوانی تریش وەرەقەی کەسێك بەرزبکەنەوەو دڵی خۆیانی پێخۆش بکەن؟

٣-زاناکان پێویستان بەتەزکیە نیە !!

دکتۆر مستەفا زەڵمی زانایەکی پایەداری کوردی خۆمانەوە لەسەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا ناسراوە و خەلأتی رێزلێنانی لەئەزهەر وشوێنانی تریش وەرگرتووەو رۆژێك وەرەقەی کەسێکی بەرزنەکردەوە ، بە زانست و بۆچوونەکانی خۆی جێی خۆی کردۆتەوە ، تەنانەت بۆچوونی خۆی هەیە ، کەدەڵێت : بەردەبارانکردنی زیناکەری محصن لە ئیسلامدا نیە ، یان نەسخ لە قورئاندا نیە ، ئەمانە هەمووی بەڵگەی خۆی هەیەو

خستویەتیە روو بۆ زانایانی دونیا ، بەبێ ئەوەی کەس بکا بەبیدعەچی و بەبێ ئەوەی بێڕێزی بکات بەرامبەر بەکەس ، بەوەش هەموولایەك ڕێزی دەگرن تەنانەت سەرۆکی حوکمەت لەوێنەیەکدا بەچیچکانەوە لە خزمەتیایەتی چونکە دکتۆر لەسەر کورسی کەمئەندامەکانە لەبەر پیری .

بەهەمان شێوە دکتۆر عەلی قەرەداخی بەبۆچوون و لێکۆڵینەوە ئابووریەکانی و کاری بۆ ئیسلام لەسەرتاسەری دونیادا ڕێزی لێدەگیرێت و یەکێتی زانایانی موسڵمانی جیهان هەڵیانبژارد بە ئەمیندار، ئەمە بەبێ ئەوەی ڕۆژێك وەرەقەی کەسێك بەرزبکاتەوە.

٤- هاوەڵان کەخۆشەویست (د.خ) مژدەی بەهەشتی دابوو بەهەندێکیان کەچی لەمن و تۆ زیاتر لەقیامەتیان دەترسان و هەرگیز خۆیان بەوەوە هەڵنەدەکێشا .



## ئەریٰ بەڕاست بیدعەیە یان نا ؟

هەموو ساڵێك ئەم بەزم و بازاڕو موناقەشەیە دووبارە دەبێتەوە ، یادی مەولودبیدعەیە یان بیدعە نیە ، وابزانم ئەوەی پێناوێت کیٰ بەبیدعەی دەزانێت نەیکات و کێش بەبیدعەی نازانێت با لەو چەندرۆژەدا بەهەر شێوازێك خۆشەویستی خۆی دەردەبڕێت بۆ ئەو زاتە دەریبڕێت .

مەدخەلیەکان ئەڵێن مەجالی تیانیە ئەوە بیدعەیەوبیدعەش گومڕاییەو گومڕاش ڕێك بۆ ناوڕاستی جەهەننەمە .

باواز لەوەبێنم ،چەند ساڵە بۆخۆم ڕۆژی ١٢ ی ڕەبیعول ئەوەل حەزدەکەم بچمە دەرەوەو ئەو دیمەنی دەربڕینی خۆشەویستیە ببینم و بەدزیەوە لەعەشقی خۆشەویستدا جاروبار فرمێسکێك بڕێژم .ئەمڕۆ ڕەبیعول ئەوەلی(١٤٣٥-٢٠١٤ )ئەمدم بینی :

١-کۆمپانیای کۆڕەك بەیانی خێمەی دانابوو لەبەردەم بیناکەیداو شیرینیان دەبەخشیەوە و سروودیشیان لێدەدا لە خۆشەویستی خۆشەویستا .

٢-سەرجادەکان نوقوڵ و شیرینی و گەصی ڕێژنەش لەلای مزگەوتی گەورە لەفەی دەخشیەوە .

٣- هەندیٰ تاکسی بەخۆڕایی ئەمڕۆ کاری دەکرد لەیادی خۆشەویستا .

٤-لەبەر بازاڕی خەفافیش کاك ئارامی شێلم فرۆش بەخۆڕایی شێلمی دەبەخشیەوە لەخۆشەویستی نەونوری چاوانەدا ، کەئەمەپیشەی ساڵانەیەتی ، لێم خواردو دوعای خێرم بۆکردو وێنەشم گرت .

٥- لەمزگەوتی گەورەش ئاهەنگی یادی فەخری عالەم بوو ..

٦- لەفەیس بوکیش یادی هەولێریەکان هەرباس ناکرێت .

جا توخوا تۆ بڵێی خوای گەورە ئەمانەکەهەرکەس بەجۆرێك تەعبیر لەخۆشەویستی خۆی دەکات بۆ پێغەمبەری ئاخر زەمان ،بیانخاتە ناو دۆزەخەوەو بەبیدعەچی ئەژماریان بکات ..من وانازانم .. ئێوەش کەیفی خۆتانە .

مەدخەلیەکان دەڵێن : ئەم حیزبە ئیسلامیانە ئەم یادە بۆ کەسبکردن و بۆ حیزبایەتی بەکاردێنن، گوایا ئەوە خزمەت نیە بەئیسلام ،گریمان وایە بەڵام ئەوانەی رووبان تێدەکەن هیچ بەرمان بۆدەگرن ؟؟، ئەوانە ئێمە نایانکەینە داپۆشراو نایانهێنین بەرەو مزگەوت، فێری ئیسلامەتیان ناکەین ؟

هەزارەها مەلاو دکتۆرو ئەندازیارو مافناس وکەسانی تر کە لە تاریکایی و نەفامیەوە فێری ئیسلامەتی کراون وشانازی بەئیسلامەوە دەکەن ئایا ئەمە لە تەرازووی خوادا کەمە ، برادەرێکی ئەندازیار وتی ساڵی پار لەمزگەوتی مەجید بەگ لەتەراویحدا سەیری دەورووبەری خۆم کرد ٢٧ ئەندازیارم ژمارد کەدەمناسین ، ئایا ئەگەر ئەم رابوونە موبارەکە نەبوایە ئەمانە لەکوێ دەبوون ؟تۆزێ ویژدان باشە !! ئەی ئەوانەی کە پیاوی وەلی ئەمرە فاسقەکانن ئێمە قسە ناکەین هێشتا ئێوە قسەدەکەن .!!



## سەلەفییەت چییە؟؟

کاك عبدالله فایەق لەرۆژنامەی ئاوێنەدا دەڵێت:ئەگەر لەبچوکترین تاکی سەلەفیی بپرسیت سەلەفییەت چییە؟! لەوەڵامدا دەڵێ: بریتیە لە(باوەڕو کارکردن بەقورئانو سونەت بەتێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت!) ئەو تاریفکردنە رەهاییە بەو شێوە گشتگیرە کێشەی زۆر بۆ بنەچەی خۆیان دروست دەکات، باشە گوتمان بەتێگەیشتی سەلەف، بەڵام کامە سەلەف؟! ئەو سەلەفەی ئەوان مەبەستیانە بریتیە لە ٣ سەدە بەراییەکەی مێژووی موسڵمانان، پشت دەبەستن بەو ریوایەتەی کە ئەفزەلییەتی ئەو سێ قەرنە

دیاردەخات " هەرچەندە لەسدر ئەو ریوایەتە تێبینم هەیەو دەیان کێشەی تێدایە"جا ئەو سەلەفی ئەوان باسی لێوەدەکەن خاوەنی یەك تێگەیشتن و فەهم نەبوون نەلەقورئان نەلەسونەتدا!

لەڕووی فقهی ،ئاقیدەیی،تەفسیر..هتد ڕاجیایی و خیلاف لە نێوان هاوەڵان دا هەیە چ جای تابعین و تابعی تابعیین ! ئەصحابی کیرام لە باسە ئاقیدەییەکانیشدا یەك تێگەیشتنیان نەبوو، بۆ نمونە لە بابەتی دیتنی خودا لەلایەن حەزرەت (د.خ) لە ئیسرا و میعراج ئایا بەچاوی بەرچاوی سەر دیوبەتی یان بە چاوی دڵ و شێوە خەوتوویی؟! ئەوا رایان جیایە.

هەروەها لە بابەتی (قەدەر) و ئازادیی مرۆڤ لە کردەوەدا دیسان ڕا جیایی هەیە لە نێو صەحابەکانی حەزرەت د.خ. چینی دوای صەحابە کە سەلەفییەتی ئیمرۆ بە سەلەفی خۆیان دادەنێن، دیسان ئەوانیش خاوەن یەك تێگەیشتن نەبوون لە لەباتە فیهی و هەم ئاقیدەییەکان دا " ئەتوانی بگەرێیتەوە سەر (شرح العقيدة الطحاوية_سيد حسن السقاف /ص ٢٠٥_٢١٥) ئەو ڕاجیاییە بە درێژی باسدەکات لە سەردەمی ئەصحاب و دوای ئەوانیش"

ئیمام (ئەبو حەسەنی ئەشعەری) دەڵێ: یەکەم پەرتەوازەیی و راجیایی لەنێوان موسڵمانان لەدوای وەفاتی پەیامبەرەکەیان لەسەر ئیمامەت (سیاسەت) بوو _ أول ما حدث الاختلاف بين المسلمين بعد وفاة نبيهم اختلافهم في الإمامة _ مقالات الإسلامين ج١ ص٣٤. جا ئەگەر هەر لەدوای وەفاتی حەزرەت ئومەی ئیسلامی لەسەر بابەتی سیاسەت راجییایی

هەبوو بێت، ئێمە بەفەهم و تێگەیشتی کامدیان بکەین؟! تەنان صەحابەکان لەسەر بابەتی تەفزیلی چوار یاوەرەکەش کۆك و هاودەنگ نینە، دەستەیەك پێیان وابوو کە ئیمامی عەلی لەپاش حەزرەت لەهەر هەموویان گەورەترە، کە ئەوەش سەد و هەشتا پلە پێچەوانەی تێفکرین و ئاقیدەی ئیمرۆی سەلەفییەت و سوننی تەقلیدی یە!

تیۆری (جەبر) کە قێزەونترین تیۆری سیاسی دەستی بەنی ئومەیەیە لەو سەردەمەدا کێشە لەسەریدا گەیشتە لوتکە، ابن المرتضي خاوەنی کتێبی ( المنية والأمل)دەڵێ تیۆری (جەبر) لە دەوڵەتی موعاویە و مەلیکەکانی بەنی مەروان سەریهەڵدا، ئومەوییەکان لەپێشتر نەبوون بۆ فەرمانرەوایەتی موسڵمانان، زۆر صەحابەی دیکە هەبوون کە بەر لەوان موسڵمان بوون و شەرەفی صوحبەتییان زێتربوو، لە کاتێکدا موعاویە و مروان بن الحكم لە (الطلقاء)و موسڵمانبووە پایانییەکان بوون!

جا بۆ پینەکردنی ئەو نەشیاوەییان، وە بۆ پەردەپۆشکردنی زوڵم و خوێن رێژی و فەسادی ئاکاری و ماددی خۆیان دەبوا پەنا بەرنە بەر حیلەیەك، جا هیچ فیکرەیەك چاتر نەبوو لە تیۆری (جەبر)، هەرچیان دەکرد دەیاندایە پاڵ قودرەتی خودا و خەڵکییان پێ فریو دەدا _الاصفهاني/ كتاب الأغاني ج١٠ ص٩٩. ئەوکاتەی (عبدالملك بن مروان) عمری کوڕی سعید ی کوشت، یەکێ لە مەلا و فەقیهە دەربارەکانی بە خەڵکەکەی راگەیاند: پێشەوای باوەرداران کە هاوەڵەکەتانی کوشتییە هەر ئەوەیە کە لە قەزای پێشینەی خودا نووسراوە

و فەرمانەکەی جێبەجێ کرد _إن أمير المؤمنين قد قتل صاحبكم بما كان من القضاء السابق والامر النافذ _ ابن قتيبة / كتاب الإمامة والسياسة ج٢ ص٤١.

لە پەرچەکرداری ئەم تێزە قێزەونەی بەناو ئەمیری ئیماندارەکان، دەستەیەك لە ئۆپۆزسیۆنی فیکری دروستبوون و بەرهەڵستکاری مەبدەئی جەبری ئومەوییەکان بوون، جا ئەو بەرهەڵستکارانە ناونران قەدەرییە، لەبەر ئەوەی باوەڕدارن بەوەی کە مرۆڤ قەدەری خۆی بەدەست خۆیەتی! سەرچاوەکانیش دەڵێن یەکەم کەس ( معبد الجهني)بوو کە لە ساڵی ٨٠هـ وەفاتیکردووە، وە یەکەم جاریش ئەو بەرهەڵستکارییەی خۆی لەلای پێشەوای مەعریفە و عیرفان (الحسن البصري) درکاندووە و پێی گۆتییە: يا أبا سعيدهؤلاو الملوك يسفكون دماو المسلمين ويأخزون أموالهم ويقولون انما اعمالنا على قدر الله.

من نامەوێت لێرەدا بچمە نێو تەفاصیلی ئەو بابەتە کەلامی و ئاقیدەییە، ئەو تێزە کتێبی تایبەتی گەرەکە تا ڕۆشەنی بکەینەوە، بەڵام خاڵی سەرەکی مەبەست لەوەدایە کە: ئەم کێشمەکێشە زەبەلاح و ڕاجیایی و پەرتەوازەییە لەسەر بابەتە ئاقیدەییەکان هەر لەو سەردەمە دابووە کە ئەوانە بە سەلەفی صالح ناوزەندی دەکەن! خاوەن یەك دید و بۆچوون نەبووینە نە لەدین نە لە ژین، کەوابێ کوا لەکێیە مەنهەج و فەهمی سەلەف ؟!

ئەگەر بڕیار وابێت کە ئەو سێ سەدەیە سەلەفی صالحن، دەی هەر لەو سێ سەدەیە مەدرەسە کەلامی و عیرفانییەکان سەریانهەڵدا، لە معتزلە _ شیعە _ ئەشاعیرە_زیدیە_خەواریج ...هتد هەموویان لەو سەردەمەبوون کە ناوزەندکرایە بە سەلەفی صالح، ئایا سەلەفییەتی ئیمرۆ ئامادەیە بە فەهمی ئەو مەدرەسانەش لە دین تێبگات؟ هەموو فیرقە و مەدرەسەیەك سەلەفی صالحی خۆی هەیە، گەر بۆ سەلەفییەك ئیمام ئەحمەد و بن تەیمیە و بەربەهاری و بن عەبدولوەهاب سەلەف بێت، بۆ بابایەکی ئەشعەری ئیمام غەزالی و رازی و جوەینی و باقلانی و کەوسەی ...هتد سەلەفە، بۆ کەسێکی معتزلی واصل و جاحز و قازی و زمخشری ..هند سەلەفە. لەراستیدا ئەو چەمکە (تێگەیشتن بە فەهمی سەلەفی ئوممەت) لە وەهمێك زیاتر شتێکی تر نییە، وە نە نەیاران نە بانگەشەکارانی سەلەفییەت ناتوان پێناسی سەلەفی صالح بکەن، یان دەستنیشان و تەحدیدی بکەن.

ئەوان کاتێ دەڵێن ( تێگەیشتن بە فەهەمی سەلەف) بۆ هەر بابەت و پرسێکی ئاینی و ژینی یەکسەر دەگەڕێنەوە بۆ مجموع الفتاوی بن تەیمیە کە بەر لە ٧٠٠ ساڵ وەفاتیکردووە، فەهم و بیرکردنەوەی خۆیان لەکار دەخەن و تەسلیمی فەهم و تێفکرینی ئەو زاتە دەبن بەو پێیەی سەلەفی صالحی ئەوانە! ئایا مەقاصیدی شەرعی و عەقڵی سەلیم ئەوەی قبولە کە فەهم و راکانی بن تەیمیە کە ٧٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا لە ژینگە و جوگرافییایەکی تەواو جیاواز دەریبڕیووە رێك کۆپی پەیستی بکەین بۆ ئەو سەردەم و ژینگەیەی ئێمە تێیدا دەژین؟! هێشتا گەر بگوترابا ( بەسورد

وەرگرتن لە فەهمی سەلەف) تا رادەیەك مەعقولتربووا نەك تۆ عەقڵ و ئاوەزی خۆت تەسلیمی بەر لە ۷۰۰ ساڵ بکەیت، ئەوە گەر مانایەکی هەبێت بریتیە لەوەی کە: سەلەفیەت بەمردوویی لەسەر ژیانن!

## نامەیەکی زۆر گرنگ

نامەیەك کە مەدخەلیە جامیەکان سفردەکاتەوە ودەمکوتیان دەکات ، هەرکامیان باسی وەلی ئەمری کرد ئەم نامەیەی بدەنێ ، کەخوا بەم نامەیە سرِی هەڵماڵین ، تا ئیتر گەنجێکی کوردی داماوی دۆ نەدیو پێیان نەخەڵەتێت و بزانێت ئەم بیرو بۆچوونە سەقەتانە لە کوێوە وەردەگرن .. نامەیەك لە شێخی مەدخەلیەکانی میسرەوە بۆ شێخ رەبیعی مەدخەلی ......یاشێخ فریامان بکەوە ئێمە بە بەهاری شۆرش گەلێك بەگیر هاتووین کە هەموو بەرنامەکانی تێکداووین بەسەریەکد.

رِێزدار شێخ رەبیعی مەدخەلی پێشەوای سەلەفیکان لەم زەمانەدا وهەڵگری رایەی الجرح والتعدیل خودا بتانپارێزێ ..السلام علیکم ورحمه الله وبرکاته

سڵاوێکی پاك بۆ بەرێزتان لەسەر زەووی کینانەوە بەرێزتان زانیوتانە چی بەسەر برایانی خۆتاندا هاتووە لەم وڵاتی مصرەداو لەم رِۆژگارەدا بەجۆرێك ئەو شۆرشەی کە رِوویدا دژ بەسەرۆك موبارەك هەموو بنەماکانی ئێمەی لەرزاند بەشێوەیەکی زۆر ترسناك وە مەزهەبی سەلەفی لە مصردا توشی شەلەل کردووە، خستوینیەتە واقعیکی نوێوە کە بواری دەرچونمان نیە لێی بەرِەچاو کردنی ئەو بنەمایانەی کە بۆتان داناوین وەئەوەی کە زۆربەی برایانی سەلەفیمان پەیرِەوی لێدەکەن لە وڵاتە عەرەبیەکاندا.

سوپاسی خودا دەکەین کە تەمەنی جەنابتانی درێژکردەوە تا بۆ خۆتان شاهیدی ڕووداوەکان بن وە بنەما گەلێکمان بۆ دانێن بۆ چۆنێتی مامەڵەمان لەگەل ئەم واقعە نوێیەدا لەبەرئەوەی ئەو بنەما پێشووانەی کە بەرێزتان دارێژەری بوون لەڕابردوودا ئێستا ڕێك نایەتەوە لەگەڵ ئەم واقعە نوێیەدا.

وە بە گومانی من ئەی جەنابی شێخ ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە توشی بووین لە مصرد هەمووبراياتمان توشيان دەبێت لەوڵاتانی عەرەبی تردا وادیارە گەلان جوڵاون و وە ئەو مەزهەبەی ئێمە کە لەسەربنەمای رازی کردنی خەلکی بە گوێڕایەڵییان بۆ وەلی ئەمرەکان لە هەمووبارو دۆخێکدا هاتۆتە لەرزین.

بەدڵنیاییەوە وێنەی وەلی ئەمرەکەمان لە زینداندا ولە قەفەزی تاواندا وێنەیەکی ترسناك بوو کە بنەماکانی سەلەفێتی ئێمەی هەژاند و لەڕیشکەوە بنکەنی کرد ، شۆڕش کرا بەسەر وەلی ئەمر داو ئێمەی سەلەفی نەك سەرخەری نەبووین بەڵکو پشتیشمان تێکرد .

ئەم شۆڕشە واقیعێکی نوێی خولقاندو گەلیش داوای هەڵبژاردنی پاك و ئازادانە دەکات وە بەڕێزیشتان هەڵوێستی سەلەفیدت دەزانن لەم بارەی هەڵبژاردنەوە کە بەدورستی نازانین و وەکاری سیاسیش بۆ گەیشتن بە دەسەڵات بە دروست نازانین ئێمە ئەگەر چووینە گەمەی هەڵبژاردنەوە دووجار شکست دەخۆین :

یەکەمیان/ ئێمە کار بەهەڵوەشێنەرەکانی مەزهەبی خۆمان دەکەین ئەوەی کە لەبەرێزتانەوە فێرکراوین ,

لەو هەڵبژاردنانەدا شکستەخۆین چونکە برایانی موسڵمان جەماوەرێکی زۆر زۆرترو بەربڵاوترو رێکخستنی تۆکمەتریان هەیە لە ئێمەی سەلەفی ، کەوابوو ئێمە ئێستا باجی ئەو بنەمایانە دەدەین کە مەحرومی کردووین لە رێکخستن و کاری حیزبی وکاری سیاسی، خۆ ئەگەر ئێستا دەست بکەین بەکاری سیاسی و حیزبی ئەوە بەدەستی خۆمان بنەماکانی خۆمان تێك دەشکێنین ، بنەماکانی سەلەفی بوونمان، پاشان لەوەش دەترسین کە فەتوا لەدژمان دەربکرێت لەلایەن جەنابتانەوە یان لە سەرانی سەلەفی و بەوەش دەرمان بکەن لە سەلەفیەت .

پاشان ئەم هەڵبژاردنانە لەمەودوا واقعی نوێ دەخوڵقێنن و سەرۆکی نوێ دەهێننە پێشەوەبۆ میسر ئیتر سەرۆکی هەتاهەتایی نامێنێت، ئایا دروستە ئەوانەبکەین بە وەلی ئەمر، بەتێبینیەوە کە ئەوان لەرێگای هەڵبژاردنەوە هاتوون و سەلفیەتیش دانی پێدانانێت، هەروەها بۆی هەیە کەسێکی ئیخوانی یان عەلمانی یان لیبراڵی و صۆفی بێت.

ئایا ئەرکی ئێمە چی دەبێ لە ئاوا حاڵێکدا و چۆن مەزهەبی سەلەفی خۆمان بگونجێنین لەگەڵ ئەو واقیعە نوێیەدا؟

شێخی بەکاری بلیمەتمان

ئێمە کەوتوینەتە تەنگبەرەیەکی گەورەوە کاتی کە شۆڕش زاڵ وبراوەبوو ئێمە چپەچپی ئەوەمان بوو کە دەبێت خاوەن هێزو بڕیار گوێڕایەڵی بکرێت، ئەوەی کە ئێستا بوتەخاوەن هێزوبڕیار گەلە وە وەلی ئەمری پێشوو ئێستا زیندانە خۆ ئەگەر کاتی خۆی بکوژرایە لێمەش دەرباز دەبووین لەم تەنگەژەیە بەڵام ئەو

زیندووەو دادگایی دەکرێت، ئایا کامانەن ئەو بنەما شەرعیانەی کە بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن  لەگەڵ وەلی ئەمری پێشودا ڕێنماییمان دەکەن؟ وە ئایا ڕاستی ئەم فەرموودەیە چۆنە ( هەرکەس سوکایەتی بە دەسەڵاتداربکات خوا سوکایەتی پێدەکات)   ئایا دروستە گوێڕایەڵی زاڵبوو ئەگەر هاتوو زاڵبووەکە گەل بوو نەك کەسێکی دیاریکراو بەڵکو گەلێکەو نازانین کێیان دواجار لێدەبێت بە دەسەڵات دار؟.

شێخی زانامان جەنابی ڕەبیع خودا سەرکەوتووت بکات:

جەنابت دەزانیت کە شێخی سەلەفی عبدالمحسن العبیکان کاتی خۆی فەتوای دا بەوەی کە برێمەر وەلی ئەمرەو پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت لەبەر ئەوەی لە ڕێگەی هێزەوە زاڵبووە بەسەر عێراقیەکاندا خۆ ئەگەر زاڵبووەکەی مصریش کە سێکی بیانی بووایە ئەوا لەسەر هەمان فەتوای عبدالمحسن العبیکان قیاسمان دەکردو فەرمانمان بەخەڵکی دەکرد کە گوێڕایەڵیان هەبێت بۆ دەسەڵاتداری زاڵبوو کە بیانییە، بەڵام ئەوەی مایەی نیگەرانی ئێمەیە ئەوەیە ئێستا کە گەل زاڵبووەو زۆرینەی ئەو گەلەش لە ئیخوان موسلمینن وە ڕۆڵێکی کاریگەریشیان هەیە لە شۆڕشەکەدا.... وە ئێمەی سەلەفیش لە مصر لە واقورمانێکی زۆر ترسناکداین ، خۆ ئەگەر هاو هەڵوێست بین لەگەڵیان وەکو ئەوە وایە کە دائمان نابێت بە شۆڕشەکەیاندا، خۆ ئەگەر خۆمان دارنی لەبەشداری شۆڕش و جوڵەی سیاسی ئەوا پەراوێز دەخرێین لەبەر ئەوەی ئێستا سەردەمی ئازادی فیکرەو ئیتر نابینە خاوەنی وەلی ئەمریش تا خۆمانی پێ بەهێزبکەین بەسەر ئەوانی تردا ئایا چارەسەری ئێمە چیە لەم دۆخە ئاڵۆزەدا؟

بەڕاستی سەلەفیەکانی مصر ناتوانن کە دەسەڵاتدارەکانی سعودیە بکەن بە وەلی ئەمری خۆیان ئەوەش لەبەر هۆکارگەلێك یەکەمیان : ئەوەی کە سعودیەکان مالی فەرمان ڕەوایەتیان نیە بەسەر مصریەکاندا و ،دووهەمیان: هەڵوێستی پاشای سعودیەبوو پاشا عبداللە لەگەڵ حوسنی موبارەك و تۆمەتبارکردنی شۆڕشگێڕان بەوەی ئاژاوەچین، ئێستا بارودۆخەکەلای ئێمە هەستیارە ... ئایا ئەو وەلی ئەمرە کێیە ئەمڕۆ کە دەبێت ئێمە شوێنی بکەوین وە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو بارودۆخە نوێیەدا بکەین؟

جەنابی شێخ: ئێمە ئومێدمان وایە ڕاوێژتان هەبێت لەگەڵ برایانی سەلەفی خۆماندا لە وڵاتانی عەرەبیدا بەتایبەت مصریەکان ئەوانەی کە کۆچبەرن و لەو وڵاتانەدان ئەوانە لێهاتووترن بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەی دەربازبوونمان لەم تەنگەژەو دەتوانن بنەماکانی سەلەفیەت بگونجێنن لەگەڵ بارودۆخەکەدا وە وای بەباش دەزانین کە ئەو ڕاجیاییانەی کە لەنێوان جەنابتان و ئەواندایە لەبیربکرین تا ئەوەی پێکەوە کۆببنەوە لەسەریەك کەلیمە بۆ سەلەفیەکان بۆ ڕزگاربوون لەو ترسەی کە هەڕەشەی لە ناوچوون دەکات لە سەلەفیەکان وە خوازیارین لەمەودا ڕاوێژ هەبێت لە نێوان جەنابتان و ئەواندا بۆئەوەی هەڵوێستێکی شەرعمان بدەنێ لەوانەی کە باسمانکرد کە کورتیان دەکەمەوە لەم چەند خالەدا :

یەکەم: ئایا هەڵوێستی ئێمەی سەلەفی دەبێت چۆن بێت بەرامبەر ئەو شۆڕشانەی کە لە وڵاتانی عەرەبیدا هەڵدەگیرسێت؟ وە ئێمە دەبینین کە بەشێوەیەکی بەربلاو شۆڕشەکان لەگەشەدان و لەوانەیە ڕۆژێك بێت یەك دەسەڵاتداری عەرەبی لە کۆنەکان نەبینین، بەڵکو بارودۆخێکی نوێی وا دێتە ئاراوە هەموو

کاربەدەستەکان بە هەڵبژاردن دێنە سەر حوکم و تەنها بۆ چوار ساڵ ، ئایا سەلەفیەکانی ئێمە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو بارودۆخە نوێیەدابکەین؟ .

دووهەم: بنەمای:( پێویست بوونی گوێڕایەڵی دەسەڵاتدار لە هەموو بارو دۆخیکدا) بەڵکو جەنابی شێخ چاوێکی پێدا بخشێننەوە تا ئەوەی سەلەفیەکان دەست واڵابن و پەروایزیکی ئازادیان هەبێت تا ئەوەی ڕەخنەی هەندێك کاروبار بکەین تا نەبینە هۆکاری خراپ و بارگرانی لەسەر بارو دۆخەنوێکان ،بابە شێوەیەك بین کە بەشمان هەبێت لەگەڵدا بەوەی ڕەخنەی هەڵەکان بکەین وئامۆژگاریمان هەبێت بۆ وەلی ئەمرەکان لە هەڵەکانیاندا.

سێهەم: بنەمای ( گوێڕایەڵی دەسەڵاتداری زاڵبوو لەڕێگەی هێزەوە تەنانەت ئەگەر ستەمکارو بیایش بێت) بەڵکو جەنابتان وبرا سەلەفیە زالستخوازەکان چاوێك بەم بنەمایەشدا بخشێننەوە لەبەرئەوەی وا دیارە نارێك و نەگونجاوە لەسەردەمی ئەم شۆڕشانەی وڵاتانی عەرەبیدا ، چونکە گەلان ژێربارو دەستەمۆنابن بۆ ئەوانەی کە بە زەبری هێز خۆیان دەسەپێنن، وەشۆڕش بەسەر هەموو ئەو کەسانەشدا دەکەن کە داخوازییەکانی گەل بە جێناهێنن .

چوارهەم: چاوخشاندنەوە بەهەڵوێستەکانمان لەبارەی سیاسەت و چوونە ناوکاری حیزبیەوە لەبەر ئەوەی لەم بارودۆخە نوێیەدا هیچ جیاوازییەك بۆ وەلی ئەمر نامێنێتەوە بەڵکو هەموو هاوڵاتیەك مافی دەنگدانی دەبێت و بەڕای خۆی بەشداری دەبێت و وەلی ئەمریش خۆی لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە دەگاتە سەر حوکم و هەربۆیە ڕیزپەڕیمان لەو بارودۆخە نوێیە دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی زۆربەی شوێنەکەوتوانمان دەبنە شوێنکەوتەی تەبلیغیەکان و ئەوکات جیاوازی

نێوان ئێمەو ئەوان چیە گەر ئێمەش تەنها بە گۆشەگیری وبە وانە وتندووە خەریکبووین و هیچ کاریگەریەکمان لەسەر واقیعەکە نەما؟ ئەی بۆچی هەوڵ نەدەین بۆ گەشتن بە دەسەڵات لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە بۆ ئەوەی بتوانین پرۆگرامی سەلەفیێی خۆمان لەو ڕێگەوە بلاو بکەینەوە؟

پێنجەم: چاوخشاندنەوە بە هەڵوێستەکانماندا لەبەرامبەر پێرەکانی وەك ئیخوان و غەیری ئەوان، ئایا دەتوانین هاوپەیمانیەتی سیاسیان لەگەڵدا بکەین بەتایبەت ئەوکات ئێمە دەبێت تەنازول بکەین لە بنەماکانی سەلەفییەت ئەگەر هاتوو بەشداریمانکرد لە هەڵبژاردنەکاندا یان وادەبینن کە دوورست بێت هاوپەیمانی بکەین لەگەڵ عەلمانیەکان و لیبراڵیەکان دژ بە ئیخوانەکان ئەگەر ئێوە وایدەبینن کە ئیخوان ترسناکترن لە عەلمانیەکان و لیبراڵیەکان لەسەر عقیدەی سەلەف.

داوای لێبوردن دەکەم لەوەی درێژەم پێدا لە خزمەت جەنابتانا بەڵام پرسیارەکان زۆر گرنگ و چارەنوس سازن بۆ سەلەفیەکانی مصر کە توشی شۆکی کردووین وە ئێمە پێویستمان بە ڕێنمایی هەیە لە جەنابتانەوە خودا سەرکەوتووتان بکات،وە ئێمە لە چاوەڕوانی وەلامیچاوڕۆشنکردنی زانستیانەی جەنابتانین هیوادارین دوانەکەون لەوەلامدانەوەمان خودا سەرکەوتووتان بکات.خۆشەویستان و خزمەتکاری سەلەفییەت لە مصر (دکتۆر...)..

گرنگ ناوەرۆکی نامەکەیە بۆیە ناوی دکتۆرمان لابرد.

## لای مەدخەلیەکان زۆربەی زانایان بیدعەچی و گومڕان :

ئەوە دستنوسی لەتیف ی مەدخەلی یە

کەوتووەتە گیانی ئەو زانایانە و

تومەتباریان دکات بە ناوی نەشیاو

لە کاتیکا هەندیکی زۆر لەوانە

بە قەد تەمەنی لەتیف خزمەتی

ئیسلام و سوننەتی کردووە

جرح و تعدیییییل هههههه

یان بوهتان و ناوزەد کردن

خوشبەختانە هەندیکیشان

تا دوینی مەدخەلی بوونە

ئیستا بەر شەقی یەك کەوتوون

::::::::::::::::::::::::

ئەوە بەشی یەکەم بوو

سەربازی نەناسراو

ئەم زانایانە زۆربەیان دکتۆرایان هەیەو کاکە لەتیف یەکێ دەکا بەگومڕاو ئەوی تر بەبیدعەچی و ...هتد ، ئەمە بێجگە لەناووناتۆرەی خراپ کە بەدەمیانا دێت و ئەیسەپێنن بەسەر ئەوانەی کە بەدڵیان نەبێت ئەوە بوختان بۆکردنیش ئاسایە ..ئەمەش دوو دەست خەتی مەلا لەتیف:

## حەسنی ناموبارەك و نەخۆشێکی ئەڵمانی!

لە نەخۆشخانەیەکی ئەڵمانیا و لە پەنا ئەو ژوورەی سەرۆکی پێشووی میسر" حوسنی موبارەکی تێدا چارەسەر دەکرا، نەخۆشێکی ئەڵمانیی ڕەگەز هەبوو، ئەو نەخۆشە سەرنجی دا، ڕێوشوێنی هێمنیی توندۆڵ گیراوەتە بەر، کاتێك کە زانی، ئەوەی لە ژوورەکەی پەنایدا چارەسەر دەکرێت، سەرۆکی میسرە، لە داروودەسەکەی حوسنی موبارەکی پرسی: ئەم کابرایە، چەند ساڵە حوکمی میسر دەکات؟

گوتیان: ٢٥ ساڵە.

نەخۆشە ئەڵمانییەکە گوتی: بێ ئەملا و ئەو لا، ئەم کابرایە، گەندەڵێکە لەو گورەی. چونکە گەر کەسێك، ئەو هەموو ساڵە، فەرمانڕەوایی وڵاتێك بکات و بۆ کاتی نەخۆشکەوتنی خۆی، نەخۆشخانەیەکی پێ دروست نەکرێت، گومانی تێدا نییە، کە گەندەڵە.. سەرباری گەندەڵبوونیشی، تاکڕەو و خۆسەپێن و دیکتاتۆریشە، چونکە دڵی بڕوایی نادا، پزیشکەکانی وڵاتەکەی خۆی، چارەی دەردەکەی بکەن و دەترسێت دەرمانخواردی بکەن.

جا ڕەبیع مەدخەلی بەقەدەر ئەو نەخۆشە ئەڵمانیەش حاڵی نیە بۆیە دەڵێت: حوسنی موبارەك لە سەرکردە مەزنەکانی ئوممەتە.

شێخ سالم ئەلشەیخی  باسی مەدخەلییەکان دەکات لە لیبیا کە چۆن ببون بەپیاوی قەزافی و  ئەو دیکتاتۆرەیان بەوەلی ئەمر دەزانی لە کاتێکدا تەواوی موسڵمانانیان بەخەواریج لە قەڵەم دەدا، ئەوەی کە جێی ئاماژە بۆکردنە مەدخەلییەکان نەك بەتەنها لە لیبیا بەڵکو لە تەواوی جیهانی ئیسلامی چونەتە ریزی دیکتاتۆرەکان و دژی گەل وەستاون .

**ئوسامە محمد مورسی :**

ئەمڕۆ ئامادەی ساتێکی مێژوویی بووم،ساتێك کە محمد بەدیع (مورشیدی ئیخوان) حوکمی لە سێدارەدان بۆ خۆی و دەیان کەسی تری ئیخوان دەرچوو،محمد بدیع لە زیندانەوە وتی:سوێند بە خوا هەزار جار لە سێدارم بدەن لانادەم لە حەق،ئیمە هەر لە خۆوە نەمانووتووە کە مردن لە پێناو خودادا گەورەترین ئاواتمانە.خوایە لێمان قبول بکە...خوایە لێمان قبوڵ بکە.



.شێخ جلال الخطيب:

شيخ جلال الخطيب

له کەنالی الرحمة شیخ جلال الخطیب تۆبەی کرد له منهجی شێواوی مەدخەلیەت له مصرو ووتی لەگەڵ إبلیس ئیش دەکەن إبلیس خۆشی ئەو شتانەی ئەوان ناکات

محمد ابراهيم شقره يەكێكە لە سەلەفييەكانی ئەردەن وپەيوەندێكی يەكجار زۆری بوە لەگەڵ شەیخ ئەلبانی وزۆر جار شەیخ ئەلبانی لە نوسینەكانی ئاماژەی بەشەیخ شەقرە كردوە هەروەكو لەو نمونەیە :

﴿ويعود السبب في كتابة هذا التخريج إلي أخينا الفاضل الأستاذ محمد شقرة، فقد لفت نظري – جزاه الله خيرا .... سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها (٦/ ١٠٢٥)﴾

**شەیخ شەقرە ماوەیەك لەگەڵ فیكری رەبیعی مەدخەلی و هاو شێوەكانی بوە دواتر زۆر پەشیمان بویەودو وازی لێهێنان و زانی كە مەدخەلیەت هەدەفی تری بەدواوەیە نەوەك خزمەتی بانگەوازی سەلەفی**




**شێخ فەوزی سەعید:**

زانایەكی سەلەفی میسریە وتی: سەلەف پیاوبوون و عەمیلی كدس نەبوون ، وەك حیزبی نووری بەناو سەلەفی كە بوونە داردەستی كودەتا چیەكان وسروودێكیان بەسەر سیسیدا وتووە بێ مۆسیقا گوایە مۆسیقا حەرامەو پشتگیری ستەمكار حەلاڵ بێت .



**بیدعە:**

مامۆستا سەید احمد لەبەرنامەیەکی راستەوخۆی سپێدە ئەم ئێوارە

وتی مەدخەلیەکان دەڵێن:

یادی مەولود بیدعەیە،یادی هیجرەت بیدعەیە،

یادی فەتحی مەکە بیدعەیە،یادی جەنگی بەدر بیدعەیە،

یادی ئیسراو میعراج بیدعەیە،،،هەموشتێك بەلایانەوە بیدعەیە!!!

بەس بەتەنها مل کەچکردن بۆ زاڵم و ستەمکاران بەلایانەوە سونەتە



## تەزکیە بۆ سعودیە!!

پانزە قوتابی کورد تقدیمی تەڵەبیان کردوە بۆ خوێندن لەوڵاتی سعودیە تەنها سیانیان وەر گیراوە یەکێك لەو بەرێزانە کەوەرگیراوە وتی بێیان وتوین دەبێ کتابی پشتگیری لای عبداللطیف بێنن تاوەرتان گرین وانە تەزکیەی حیزبی سەلەفی وەوتی بڕواناکەم عبداللطیف بۆمان بکات چونکە ئێمە سەلەفی نین.

# چوار کچی پاشای سعودیه ۱۳ ساڵه ، له ماڵەوه زیندانی کراون



٣

چـوار لــه کچـه‌کانی پاشــای ســعودیه بـەهۆی رەخنـەگرتنیان لــه بڵاوبوونـەوەی هــەژاریی لەوڵاتەکەیانـدا ۱۳ ســاڵه لەماڵـەوە زینـدانیی کراون.

رۆژنامـەی (سـەندای تـایمز)ی بـەریتانیی بڵاویکـردەوە: دووان لــه کچــەکانی مــەلیك عەبـدوڵڵای پاشــای ســعودیه لەرێگـەی نامەیـەکی ئەلیکترۆنییەوە بە رۆژنامەکەیان راگەیاندووە ئەوان ماوەی ۱۳ سـاڵه لــه باڵەخانەی کۆشکی پاشایەتی وەك زیندانیی، دەستبەسەر کراون.

جەواهیر ٤٢ ساڵو سەحەر ٣٨ ساڵو هەلا ٣٩ ساڵو مەها ٤١ ساڵ لە (عنود فایز) هاوسەری تەڵاقدراوی پێشووی مەلیك عەبدوڵڵاو (جەواهیر)و (سەحەر) لە باڵەخانەیەکداو (هەلا)و (مەها)یش لە باڵەخانەیەکی دیکەی کۆشکەکانی کۆماریداو بێئاگا لە ژیانی دەرەوە زیندانیی کراون.

بەپێی زانیارییە بڵاوکراوەکانی نێو راپۆرتەکەی سەندەی تایمزی بەریتانی، دایکی ئەو کچانەش نامەیەکی ئاراستەی کۆمسیاری باڵای مافەکانی مرۆڤی نەتەوەیەکگرتووەکان کردووەو داوای دەستوەردانی لەو کێشەیەدا کردووە.

رۆژنامەکە ئەوەشی ئاشکرا کردووە: ئەو کچانەی (عەبدوڵڵا عەبدولعەزیز) پاشای سعودیە ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە ئەوان دوای ئەوەی لای باوکیان رەخنەیان لە برسێتی و هەژاریی زۆرینەی سعودییەکانو خۆشی ژیانی هەندێك لە شازادەکان گرتووە رووبەرووی دەستبەریی بوونەتەوە.

مەلیك عەبدوڵڵا لە ساڵی ٢٠٠٥وە بووەتە پاشای سعودیە، خاوەنی ٣٨ کوڕو کچەو ١٠ ساڵ لەمەوبەریش دایکی ئەم چوار کچەی تەڵاق داوە.

## شێخ ئەنەسی سەلەفی لە میسر:



ناوبراو ئەڵێت:

وەك کەسانێکی دیندار ستەمێکی زۆرمان لە ئیخوان کرد بەڵام لێستا دان دەنێم بەوەی کە بەڕاستی ئیخوان پیاوی کاتی تەنگانەن، ماوەیەکی زۆر ژیاین وا تێگەستبووین کە ئیخوان مسلمون شوێنکەوتوانیان لەسەر جیهادو تێکۆشان پەروەردە نەکردووە تا ئەرکی بەرپرسیاریەتی و پێشەوایەتی ئوممەتی ئیسلامی هەڵگرن، بڕوامان وابوو زۆر بە زوویی دەوری سەرکردەکانیان چۆڵەکەن ( لەکاتی تەنگانە) بەڵام ئێمە نەمانتوانی خوێندنەوەیەکی دروستیان بۆ بکەین بەڵام بەڕاستی ئەوان ئیسپاتیان کرد کە پەروەردەی هەر ئەندامێکی ئیخوانی بەرامبەرە لەگەڵ سەدانی خەڵکی غەیری ئەوان لە لایانە لیسلامیەکان وە ئەوەندە فەخرو شانازی بەسە بۆ ئەوان کە هێشتا و بەبەردەوامی پارێزگاری لە شەرەفی ئوممەتی ئیسلامی

ئەکەن و بە دامەزراوی ماونەتەوە لە کاتێکا غەیری ئەوان فەشەلیان هێناوە.

بەڕاستی کۆمەڵەی ئیخوان بەڕاستی ئەوەن کە خوالێخۆش بوو شێخ عبدالحمید کشك دەربارەیان پێی فەرمووم کە ئیخوان کارگەو قوتابخانەی دروست کردنی پیاون بەڵام من ئەو کات قەناعەتم بەو قسە نەبوو بەڵام بەڕاستی ئەو شتێکی ئەدی کە ئێمە نەمان ئەتوانی ببینین. بەڵام ئەوا ئێستا دان دەنێم کە بەڕاستی ئیخوان قوتابخانەی دروست کردنی پیاوە لە کاتی تەنگانەو نارەحەتی دا ئەیانبینیتەوە ئێستا ئەوان پێشەوایەتی ئوممەت ئەکەن بە فیداکاری بەردەوامیان کە ڕۆژانە شەهیدی تازە دەبەخشن لە کاتێك دا غەیری ئەوان لە ئیسلامیەکان لە خەودان (حزبی نوری سەلەفی) وە لەکاتێك دا ئیخوانەکان دەکوژرێن حیزبی نوری سەلەفی لە هێمنی دا دەژین لە باوەشی ئینقلاب چیەکان دا بەڵکو ئەوان و ئینقلاب چیەکان یەکن لەبیرکردنەوەدا ئێستا جیاوازی نێوان ئیخوان لەگەڵ حزبی نوری سەلەفی ببینە.

## دوعاکەی قبوڵ نەبوو!

محمد حسن کاکە حەمە لە ساڵی ۱۹۸۷ دواناوەندی ئیسلامی لەکەرکوك تەواو دەکات و لەساڵی ۱۹۹۰دا پەیمانگای ئیمام و خەتیب لە بەغداد تەواوکردووەو پاشان بەکالۆریۆسی لە دیراسات ئیسلامیدا هێناوە لەساڵی

۲۰۰۱ دا لەیەمەن ، شێخ موقبیلی سەلەفی یەمەنی بینیوەلە ۱۹۹۸دا و لە ۱۹۹۸ تا ۲۰۰٤ لە سەنعای یەمەن بووە ، یەکەم گەنجی کوردە کە چووە بۆ لای رەبیع مەدخەلی لەساڵی ۱۹۹٥دا ، هەرئەمیش هانی (عەبدوللتیف)ی داوە کە بچێ بۆ لای رەبیع مەدخەلی ( خێری نەنوسرێت ئەگەر خێرە !!)ساڵی ۲۰۰٤ گەڕاوەتەوە عێراق و پاشان ساڵ ونیوێك چۆتەوە بۆ یەمەن و بەهۆی نەخۆشیەوە نەیتوانیوە دکتۆراکەی بخوێنێت و بووە ئیمامی مزگەوت .ئەم بەڕێزە پێنج ساڵ هاوەڵی (عەبدوللتیف) بووەوئاگای لە هەڵسوکەوتیەتی وبەیەکەوە فیکری مەدخەلیان وەرگرتووەو ئەم خێرو بەرەکەتەیان هێناوەتەوە بۆ کوردوستانی بەش مەینەت ، تا ئەگەر تۆزێ دین هەبێت ئەویش نەهێڵن!!

محمد دەڵێت: هەندێ شتی ( عەبدوللتیف )هەبوو کە جێی قسەوباس بوو بەڵام لەبەر خوا سەترم کرد ، جاکاتێ پێیان زیاد راکێشاو خۆی لێبوو بەقوتبی زەمانەو شێخی سەلەفیەکانی کوردوستان و کەوتە بیدعەچێتی بەخشینەوە و (بەهمەن کەلاری ) بەو دەردە برد ، نەمتوانی بێدەنگ ببم و دەبوایە لە حەدی خۆیدا رایگرم.

محمد حسن ئەو شتانەی لە ژیاننامەی ناوبراودا هاتووە بەزیادەڕەوی و ناڕاستی دادەنێت و زۆر شتی تر ئەداتەوە بە چاویاو سەرەنجام پاش ۷۰ لاپەڕەی نەی فۆڕ بە دۆکیۆمێنتەوە دەیسەلمێنێ کەناوبراو ئەوە نیە پێشەوای سەلەفیەکانی کوردستان بێ ،دەڵێت (وانا لا ابدع عەبدوللتیف لکني

اصفه بانه رجل متلون ، مصلحي ، باغ ، متبع للهوي ، متكبر كذاب ، يموت في الشهرة والزعامة ، لا يتورع عن الافتراء علي مخالفه :والله حسيبه) جا ئەم نوسراوەشی ناو ناوه ( تبصير الدرويش الكفيف بكشف التدليسات والتلبيسات التي انطوت عليها ترجمة عبد اللطيف) كه به كوردى واته: (بەرچاو ڕۆشنكردنى دەروێشى نابينا به هەڵماڵينى درۆو دەلەسەكانى ناو ژياننامەى لەتيف)..لەپەرچە كردارى ئەمەدا مەلا لەتيفيش وەلأمى دايەوە بەناوى:

الرد السريع الاليم على الكذاب اللئيم محمد كاكه السقيم الذى سكت دهرا ونطق جورا فى رسالته(تبصير الدرويش الكفيف) .

ئنجا هەر لەسەرەتاوه دوعاكەى سەعدى صحابەى لێدەكات كەكەسێك بوختانى بۆ دەكات ،كه تەمەنى درێژ بێت بەهەژارى وتووشى فيتنەش ببێت و دوعاكەشى گيرا دەبێت ،كابرا تەمەنى درێژدەبێت و هەژار دەكەوێت و تووشى فيتنه دەبێت شوێن ئافرەتان دەكەوێت بەو پيرييه !!

بەلأم (عەبدوللەتيف) دوعاكەى كەدەيكات لە محمد حەسەن كاكه ، وەرناگيرێت و هەركه محمدحەسەن كاكه دێتەوه لەعومره بەو پاكبونەوەيەوەى بەنەخۆشيەكەى دەمرێت و نەتەمەنى درێژ بوو نەهەژاركەوت و نه تووشى فيتنەش بوو دواى ئافرەتان بكەوێت ..



شيخ الاسلام الامام العلامة الزاهد القدوة البركة الحافظ العمدة الثقة الحجة واعظ المسلمين مفيد، العابد الخاشع الناسك الحافظ المتبع تقي الدين شيخ عبداللطيف احمد مصطفي حفظه الله تعالى

ئەوەی لەسەر ئەو وێنەیە نوسراوە گەر شافعی مەزهەبێك لە وەصفی ئیمامی شافعی بینوسیبایە مەدخەلییەکان دەکەوتنە تەفسیق کردنی و دەیان گوت ئەوە شیرکە و زیادەڕەویە دەیکەن؛ بەڵام ئەو وەصفانە مەدخەلییەکانی کوردستان بۆ (عبداللطیف)ی دەکەن کە ناسراوە بە[جعفر الكذاب]، ئەو قسانە دیسان ئەوە دەسەلمێنێت کە گرووپی مەدخەلی زۆر لەدەروێشەکان دەروێشترن بۆ شێخەکانیان و دەمارگیری چاوی کوێر کردوون و هەر ئەوە بەڕەوا دەزانن کە شێخەکەیان ڕێیان ڕادەگەیەنێت. ئەوەش هەنگاوی یەکەمی ڕێچەوانەی سەلەفییەتە لەبەر ئەوەی لە بانگەوازی سەلەفی دەمارگیری بۆ هیچ کەس نییە و مەدح و ستایشی بێسنوور زیلەتە بۆ خاوەنەکەی. ئەوەی کەزۆر سەیرە مەدخەلییەکان عبداللطیف بە (البركة) ناودەبەن!!

حسن پشدەری/ (پێگەی مینبەر)

## داعشیش بەوەلی ئەمر دەزانن :

ئەو جەماعەتەی دەڵێن سیسی وەلی ئەمری مصرە و دەبێت خەڵکی مصر بەیعەتی بدەنێ، ئەوە هەمان بۆچونیان هەیە ئەگەر داعش کوردستان داگیر بکات ئەوە دەڵێن: دەبێت خەڵکی کوردستان بەیعەت بدات بە ابو بکر بغدادی و بیکەن بە وەلی ئەمری خۆیان!

ئەمەش بەهۆی ئەوەی تاکە بیانووی ئەم جەماعەتە بۆ ئەوەی کە سیسی وەلی ئەمرە ئەوەیە کە سیسی توانیویەتی بە هێز و دەسەڵات مورسی لا ببات لەسەر دەسەڵات،کەواتە ئەگەر داعشیش بە هێز توانی کوردستان بگریت ئەوە دەبنە وەلی ئەمر!



تێبینی:ئەمەش کتێبێکی ئەو جەماعەتەیە لە مصر لە چاپیان داوە تا بیسەلمێنن کە سیسی وەلی ئەمرە!

## سیاسەتی سەلەفییەتی جیهانیی:

سەلەفییەت بەچاولێکەری (عەولەمە)، چەند سیاسەتێکی تایبەت بەخۆی پیادە دەکات، لەوانیش (خەلوەجە و سەعوەدە)! یانی: بە سعوودیی و خەلیجیکردنی داب و نەریت و دینداریی و فەرهەنگی جیهانی ئیسلامیی و بگرە هەموو عالەم!

بە وردییەوە لەم پۆستەی خواردوە تێرابمێنن و تێبفکرن، ئەوە فەیسبووکی بەشەکی سەلەفییەکانی (هەولێر)ە، تێیدا مژدەی ئەوە دەدات کە وتاربێژێکی سەلەفیی، توانیق گفت لە هێندێ شێخ و زانای سەلەفیی سعوودیا وەربگرێت، تاوەکو تەوجیهات و ئامۆژگاریی پێشکەشی (سەلەفییەکانی کوردستان) بکەن! ئەڵبەتە نێوی ئەو شێخە سەلەفیانەی کە نووسیویانە، یەکێکیان ئوردنیی و، یەکێکی تریان یەمەنییە!

ئایا کارەسات ناخولقێنێت؟ کە کوردان عەقڵیان تەسلیمی شێخانی وەهابیی سعودیە و خەلیج کردووە؟! ئایا ماڵ وێرانیی نیە؟ پشت لە زانایانی کوردەواریی بکەیت و، ببیە کۆیلەی فیکریی شێخەکانی وێندەری؟! ئایا ئەم جۆرە رەفتارانەی سەلەفییەکان جێگای لەسەر وەستان و، لێکۆڵینەوە و، پێداچوونەوە نیە؟! ئیدی با ئەو بەشە نادانەی ناو دەسەڵات کە پشتگیری ئەوانە دەکەن، بیزانن: سەلەفییەتی مەدخەلیی ترسناکییەکەی هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ سەلەفییەتی جیهادیی، ئەوانە هەرەشەن لەسەر ئاسایشق نەتەوەیی و (کۆمەڵایەتیی)

كوردستان! دوو ديوى يەك سكەى ژەنگاويين!!ليّرە رستەيەك بەسە:
(( داعشييەت ليّرەوە دەست پيّدەكات))

**سەيرى ئەم مژدە خۆشە !!**

**مۆژدەيەك بۆ برايانى سەلەفى شارى هەولێر ...**

دواى پەيوەندى كردنى مامۆستا سيروان ئەشقەدر - خواى گەورە بيپاريزيّت - بە چەند زانايەكەوە بۆ ئەوەى لە ريّگايەكى ئينتەرنيّتەوە بتوانن وتاريّك و توجيهات و نصائح بدەن بۆ برايان و قوتابيانى سەلەفى شارى هەولێر ، چەند زانايەك خواى گەورە بيان پاريزيّت پەيمانى ئەوەيان داوە كەوا لەنزيكترين ماوەدا وتار و توجيهات و نەصيحەتەكانيان بۆ براايانى سەلەفى پيشكەش بكەن ، لەم زانايانەى تاكو ئيّستا ئامادەى خۆيان دەربريوە بۆ پيشكەش كردن لەوانە:

-شيَخ عبدالله الظفيري - حفظه الله تعالي .

- شيَخ أسامة بن سعود العمري - حفظه الله تعالي . -

- شيَخ هاني بن علي بن بريك - حفظه الله تعالي . -

- شيَخ علي الرملي - حفظه الله تعالي . -

چاوەڕوانى زانيارى زياتر بن..

**زانایانی پایه بەرزی ئیسلام لە گرتوخانەکانی ئالی سعودا ...**

.بۆ داپۆشینی ئەمانە ... بۆ ئەوەی موسلمانان رق نەخۆنەوە کە یەکێکی شیعەی گرتووە بە ناوی (نمر النمر ) پرۆ پاگەندەیەکیشی بلاوکردوتەوە دەلێت لە سێدارە ی دەدەین پێم وانییە شتی وابکات تەنها قسەیە فەرموو ئەوە ناوی کۆمەلێك زانا :

-فضيلة الشيخ محمد الصقعبي ٨٥ عامًا

2-فضيلة الشيخ عبد الكريم الحميد ٧٠ عامًا

3-فضيلة الشيخ أحمد السناني ٦٥ عامًا

4-فضيلة الشيخ وليد السناني "ثاني أقدم عالم معتقل"

5-فضيلة الشيخ المحدث سليمان العلوان

6-فضيلة الشيخ المحدث عبد الله السعد

7-فضيلة الشيخ عبد الله الريس ٥٠ عامًا

8-فضيلة الشيخ عبد الرحمن بن عبد

العزيز السديس "ابن عم إمام الحرم المكي"

9-فضيلة الشيخ إبراهيم الريس

10-فضيلة الشيخ علي الخضير

11-فضيلة الشيخ ممدوح عبدالله بخاري

12-فضيلة الشيخ سعيد ال زعير

13-فضيلة الشيخ أحمد الخالدي

14-فضيلة الشيخ خالد الراشد

15-فضيلة الشيخ فارس آل شويهل الزهراني

16-فضيلة الشيخ عبد العزيز كاملالمصري

17-فضيلة الشيخ موسى القرني

18-فضيلة الشيخ عبد العزيز البريدي

19-فضيلة الشيخ إبراهيم الناصر

20-فضيلة الشيخ حسين بن علي العلي التميمي

21-فضيلة الشيخ خالد بن عبدالله الهملان

22-فضيلة الشيخ عبد العزيز الجليل

23-فضيلة الشيخ فهد العساكر

24-فضيلة الشيخ الشيخ محمد سالم الدوسري

25-فضيلة الشيخ عبد الله الرشيد

26-فضيلة الشيخ سعود الدرويش البوعينين

27-فضيلة الشيخ فهد الدرويش البوعينين




# علماء في سجن آل سعود

29-فضيلة الشيخ خالد العلوان

30-فضيلة الشيخ صالح العلوان

31-الشيخ ناصر العمرو " ...ليس ناصر العمر"

32-الشيخ منصور الصقعبي

33-الشيخ منصور القاضي

34-الشيخ عقيل العقيل "مؤسسة الحرمين الخيرية"

35-الشيخ سعيد الغامدي

36-الشيخ خلف العنزي

37-الشيخ سعد الشتوي

38-الشيخ يوسف الأحمد

-٣٩ فضيلة الشيخ ناصر الفهد



!

**مەلا وشيار سەلەفی دەڵێت:**

بە پێی شەرعی ئیسلام دەبێت بدرێت لە ملی سەرۆکی حزبە ئیسلامی و عەلمانیەکانی کوردستان کە هەوڵ دەدەن ببنە سەرۆك و دەسەلأت بگرنە دەست چونکە تەنها دەبیت یەك کەس سەرۆك بێت و کەس

دوای ئەو سەرۆکە بۆی نیە «ونافەسەی بکات و فیتنە دروست بکات!

ئەم مەدخەلیانە زۆر نەفامن ئێستا حکومەتداری یەك کەس نیە ، وا لەکوردوستان هەموو حیزبەکان حکومەتیان تەشکیل کردووەو خزمەت دەکەن ، ئیتر لەمل دانی چی ؟؟دەوەرە تێی بگەیەنە!!

دەمامکەکان:

(ئامادەکردنی ژیوار مودەڕیس و زیرەك زاهیدی )

ئەمڕۆ من و هەندێ لە هاوڕێیانم بە تەلەفۆن پەیوەندیمان بە کۆمەڵێك لە مامۆستایانی سەلەفیی مەدخەلی کرد، لێمان پرسین دەربارەی کەسێك یا گرووپێك کە بەسەر دەسەڵاتەوە زاڵبێت، ئایا هەر بەوەندەی حوکم دەگرنە دەست ئیتر حوکمڕانییان شەرعییە؟ ئەڵبەت ئەوە زانراوە کە لەلای سەلەفییەکان بنەمایەك هەیە بە ناوی -واجبوونی گوێڕایەڵ و ملکەچبوون بۆ پێشەوای زاڵبوو- واتە ملکەچی و گوێڕایەڵیکردنی ئەو حوکمڕاندی کەوا بە زەبری شمشێر دەسەڵات دەگرێتە دەست و زاڵدەبێ، ئیتر ئەوانە (سەلەفی) ملکەچبوون و گوێڕایەڵیکردنی بەواجب دەزانن و بە فەرمانڕەوای موسڵمانانی دادەنێن!... کە دەربارەی ئەمە لێمان پرسین، گوتیان: بەڵێ هەرکەس دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گرت پێویستە گوێڕایەڵی بکرێ.. بەو مەرجەی "موسڵمان" بێ.. ئینجا لێمان پرسین: ئەدی ئەگەر خەڵکان بکوژێ و تاوانکار بێ؟ گوتیان: بەڵێ!.. تا لێرەوە دژەواندیەك

دێته ئاراوە.. گوتمان: ئەدی ئەگەر داعش دەستی بەسەر دەسەڵات و حوکم لە کوردستاندا گرت، دەبێ ملکەچ و گوێڕایەڵیان بین؟ لێردوە دەستیانکردە منجەمنج و شلەژان.. چونکە یا دەبێ بڵێن: نەخێر، بەمەش دژەوانەی بیروباوەڕەکانیان دەبنەوە.. یا ئەوەتا دەبێ بڵێن: بەڵێ، بەمەش خۆیان تووشدەکەن.. بۆیە گوتیان: ئێستا ناتوانین وەڵامبدەینەوە و ئەڵبەت بۆ هەموو ڕووداوێك قسەی خۆی هەیە، بێگومان ئەوانە وادەبینن کە ملکەچ و گوێڕایەڵ دەبن بەڵام لە ترسان بێدەنگ بوون و وەڵامیان نەداوە! ئەڵبەت تۆماری ئەم قسانەمان لەلایە، گەر پێویست بکا بڵاویشی دەکەینەوە، بەڵام ناوەکانیاغان نەهێناوە لەبەر پارێزی! ئامانج و مەبەست ئەوەیە" ئەو خەڵکانە گەورەترین مەترسین لەسەر کوردستان و کۆمەڵگەی کوردی، لەسەر حکومەت و گەل پێویستە متمانەیان پێ نەکەن چونکە درۆ و نیفاق دەکەن کە درووشمی بانگەواز و ئاشتی بەرزەدەکەنەوە.. ئەوانە باری ئاسایش و ئەو بوارە ئازادییە دەقۆزنەوە کە هەیە لە کوردستان بۆ گەمەکردن بە کۆمەڵگە و گۆڕینی لەناوەوەڕا!! ئەوانە یەکەم کەسن کە کۆمەڵگەی کوردی بەفیرۆزدەدەن و ڕادەستی تیرۆرستانی دەکەن و دان بە تیرۆریستان دەنێن هەر کاتێك بوونیان لە کوردستاندا هەبوو! بۆیە پێویستە لەسەر خەڵك لەمە هۆشیاربێتەوە!



**.مەدخەلیەکان هەڵەن کە لایەنە ئیسلامیەکان گومڕادەکەن :**

زانا ناودارەکانی سەردەم هەرگیز بەوەرازی نەبوون و وایان نەوتووە تەنها مەدخەلی و دەروێشەکانی نەبێت ، ئەمەش فەتوای لیژنەی فەتواو قسەی زانایان لەو لینکانەوە بۆ هەرکەس حەزدەکات بیزانێت :

الرد الأول من فتاوى اللجنة الدائمة
https://www.facebook.com/photo.php?fbid=148728717486950&set=a.138280633198425 9.1073741828.100007647160905&7 theater&type=1

---

الرد الثاني من فتاوى اللجنة الدائمة
https://www.facebook.com/photo.php?fbid=148728717486950&set=a.1382806331984259.1073741828.100007647160905&7 theater&type=1

---

الرد الثالث من العلامة محمد ناصر الدين الألباني رحمه الله رداً على سؤال هل الإخوان المسلمون من الفرق الضالة .
&https://www.facebook.com/video.php?v=1487311771533714 theater&type=2&set=vb.100007647160905

---

الرد الرابع من العلامة بن باز رحمه الله
https://www.facebook.com/photo.php?fbid=148732440486578&set=a.1382806331984259.1073741828.100007647160905&theater&type=1

---

الرد الخامس من العلامة محمد ناصر الدين الألباني فى توضيح لكلام له فى شريط سابق لهذا الشريط جاء فيه :
هل صحيح مقولة إنّ خطر الاخوان المسلمين اشد على الامة من خطر اليهود و النصارى ؟ فكان جوابه : " نعم قد يكون ضررهم اكبر ولكن لا نعاملهم معاملة اليهود و النصارى" فقال الإمام الألبانى رحمه الله وطيّب الله ثراه : أن الإخوان المسلمين ليسوا من الفرق الضالة ولا أعتقد أني قلت ذلك ولو قلته فإنى أتراجع عنه ،
https://www.facebook.com/video.php?v=1487388174859407&set=vb.100007647160905&theater&type=2

---

الرد السادس من العلامة محمد بن صالح العثيمين رحمه الله وهو إهداء لغلاة التجريح
https://www.facebook.com/video.php?v=1487505724847652&set=vb.100007647160905&theater&type=2

---

الرد السابع من العلامة صالح الفوزان
https://www.facebook.com/video.php?v=1487668524831372&set=vb.100007647160905&theater&type=2

---

الرد الثامن فتوى هل الجماعات الإسلامية من الفرق الضالة
http://fatwa.islamweb.net/fatwa/index.php?page=showfatwa&Option=FatwaId&Id=7938

**لەم پەیجەوە وەرگیراوە**

www.facebook.com/SalfiaRadAlaMdklia




**مەدخەلی پەراوێکی لەسەر سەید قوتب دەرکردو لەدین دەری کردو دەروێشەکانیشی وەك تووتی ئەیلێنەوە .**

شێخی قورئانخوێن الدوسری لە یەکێك لە وتارەکانیدا دوای ئەوەی قسەیەکی سەییدی هێنا بۆوە ، گەنجێك لێی راست بوربۆوەو رەخنەی لێ گرتبوو کە بۆچی قەولی سەییدی بە نموونە هێناوەتەوە ! دواتر بە دۆسەری وتووە خۆ سەیید قوتب ریشی نەبووە !!

دۆسەری پێی وتووە : ئەگەر سەیید قوتب موو بەریشیەوە نەبووە ، بەڵام گومانی تێدا نییە کە خاوەن هەست و غیرەتێکی باش و ، خاوەن باوەڕو یەقینێکی قایم و ، خاوەن عیزەتی نەفس و رێز بوو ، غیرەتی بۆ موسوڵمانان جوڵاو ، رۆحیشی قوربانی دینەکەی کرد بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی خوا.

سەیدخاوەنی لەو قەولە بەناوبانگە بلاّوەیە کە کاتێك داوایان لیّ کرد کە لەوەی کردوێتی پەشیمان بێتەوەو داوای لێبوردن لە دەسەڵاتداران بکات ، فەرموویەتی : بۆچی داوای بەزەیی بکەم ؟! ئەگەر لەسەر حەق گیراوم حوکمی حەقم پێ خۆشەو رازیم ، ئەگەر بە ناحەقیش گیراوم من لەوە گەورە ترم داوای لێبوردن و بەزەیی لە باتڵ بکەم .. ئەو پەنجەیەی لە نوێژدا بۆ شاهێدی دان بەرزم کردۆتەوە رەفزی ئەوە دەکات وشەیەك بنووسێت ئیقراری حوکمی تاغووتی تێدا بێت ، پاشان شێخی دۆسەری بە کابرا دەڵێت : (هذا هو سید قطب فأین اصحاب الشعر بلا شعور من مواقف الرجال ؟!) واتە : ئا ئەوە سەیید قوتبە ، ئیدی کوا ئەوانەی موویان هەیە و هەستیان نیە ، هەڵویستی ئەوانە چۆن بە هەڵویستی پیاوان بەراوورد دەکرێت .

الطغيان لا يخشى شيئا كما يخشى يقظة الشعوب وصحوة القلوب، ولا يكره أحدا كما يكره الداعين إلى الوعي واليقظة، ولا ينقم على أحد كما ينقم على من يهزون الضمائر الغافية

سيد قطب رحمه الله




**شەڕی نێوان مەدخەلیەکان :**

**لە سەر مینبەرەکان هاوار دەکەن ئەڵێن جائیز نیە زەکات وخێر بدرێت بە هەندێ کەناڵی ئیسلامی ........؟؟؟؟!**

**تایبەت بە ئیسلام پەیك:**

**لەگرتەیەکی ڤیدیۆیی دا عەبدوللەتیف مەدخەلی وەڵامی مامۆستا عبدالکریم سەلەفی (مزگەوتی ئیمان) دەداتەوە کە فەتوای داوە دروست نیە زەکات بدرێت بە کەناڵی ئامۆژگاری کە سەر بە باڵی عەبدوللەتیف سەلەفیە، لەبەر ئەوەی (بە وتەی ئەو) ناچێتە ژێر هیچ کام لەو هەشت بەشەی قورئان دیاریکردوە زەکاتیان بدرێتێ.**

**شایەنی باسە پێشتر سەلەفیەکان پێدانی زەکاتیان بەکەناڵە ئیسلامیەکان بە نادروست لەقەڵەم دەدا بەڵام ئێستا کە خۆیان بوونەتە خاوەنی کەناڵی ئاسمانی دەڵێن بۆ ئێمە دروستە !!!!!!**



عەبدوللەتیف ی مەدخەلی لە بەڵگەنامەیەکی زۆر ترسناکدا!!

حەسەن پشدەری دەڵێت :چارەی گرووپی مەدخەلیان بە ڕوونکردنەوەی زانستی و قسەکردنە لەگەڵیان بەزمانی عیلم. ناکرێت مسوڵمان قسە بۆ مسوڵمان هەڵبەستێت، بەڵام دەکرێت لێکدانەوەی بەئینسافەوە بۆ هەڵوێستەکانی بکات و لە سێبەری بەڵگەی تر هەڵوێستەکانی بخوێنێتەوە .

کاك (عبدوللەتیف) بەرلەوەی بگەڕێتەوە کوردستان لە گەڵ عەرەبەکان ژیاوە و ئەوانیش خاون ئەزموونی زۆرن لەگەڵ ناوبراودا، یەکێك لەو کەسانەی باش دەیناسێت ناوی ﴿قاسم عبدالله الغنام﴾ە، ئەوکەسەش دیارە وەکو ئەو مەدخەلییە، بەڵام کێشەیان کەوتۆتە نێوان. ئەو بۆتە خەتەکەی ﴿حمدی سلفی﴾ و ﴿علی حسن عبدالحمید﴾ی ئەردەنی، ئەوکەسە بابەتێکی نووسیوە لە ﴿منتديات كل السلفين ﴾ بەڕاستی کە

بابەتەکەم خوێندەوە تووشی شۆکی کردم. دەکرێت دوو مسوڵمان کێشەیان لەگەڵ یەك هەبێت و لەسەر بابەتێك ئیختلاف بکەن" بەڵام ناکرێت کار بگاتە ئەو ئاستەی بۆ لەناوبردنی بەرامبەرەکەت پەنا بۆ هێزە ئەمریکییەکان ببەی، ئەوە بەڕاستی هەڵخلیسکانێکە و جەهلێکە بەدینی خوا و ناحاڵی بوونە لە مانای وەلائو بەرا.

حیزبە ئیسلامییەکان ئیختلافیان لەگەڵ یەك هەیە، بەڵام هەرگیز ئیختیلافەکەیان وای لێنەکردوون نوێژ لەدوای یەکەوە نەکەن و پەنا بۆ ئەهلی کوفر بەرن و تاوان بۆ یەکتر هەڵبەستن و یەکتر بەگرتن بدەن.

غەنام لە نووسینەکەیدا دەڵێت:

﴿وهذه بعض الفعاله المشينه (فتاواه بالاستعانة بالأمريكان والحرس الوطني والشرطة أو التهديد والوعيد من عصابته على طلبة العلم المخالفين له، فقد أفتى كل من عبد الحسيب (الذي رماه بالحدادية بعد أن كان المقرب والمؤتمن الذي يقدمه أماما وخطيبا وواعظا) وافتى اثنين من اذنابه قديما من اساتذة الجامعة ، بالتبليغ عن احد الاخوة) طالب علم وداعية لله عز وجل معروف) بأنه تكفيري وإرهابي وتفجيري، ومعلوم للجميع ما معنى رمي أحد في العراق بهذه التهمة، وفعَل نفس الشيء مع الأخ ...(طالب علم وداعية معروف المذكور في أوراق المصالحة)، حيث شنع عليه بأنه تكفيري، واستعان بمن يهدده ويرحله، ثم بالشرطة من خلال أتباعه أي (عبد اللطيف) وذلك لأنه خالفه في مسألة، وكذلك فعل صاحبه ورفيقه المقرب(الكذاب) مع الأخ ...(طالب علم وداعية معروف المذكور في أوراق المصالحة) حيث

هدده بتسليمه للداخلية أي شرطة بغداد وترحيله من صلاح الدين، وهذا صنيع صاحبه راكان أبو صفوت بالاستعانة بالأمريكان علي الأخ ........ باتهامه أنه تكفيري تفجيري، وهذه موثقة بالصوت والصورة ، فهذه حال العالم الزاهد الورع ، وأصحابه. ﴾

**بڕوانه:**

http://www.kulalsalafiyeen.com/vb/showthread.php?t=27517﴿

**ئەوە كردەوەی مەدخەلییەكانە لەگەڵ یەكتر عەبدوللەتیفی مەدخەلی لای ئەمریكییەكان تۆمەتی بۆ خەتەكەی حەلەبی هەڵبەستووە و ئەفەرەكانی بەگرتن داون و فەتواشی داوە كە ئەو جۆرە كارە" كارێكی ئاساییە!!**

**ئەوەی كە تووشی شۆكی كردم وەڵامەكەی عەبدوللەتیفە، لە وەڵامەكەی ناڵێت ئەوە ڕاست نییە، بەڵكو دەڵێت ئەوە ئێوە بوون چوون بۆ لای ئەمریكییەكان و هەوڵی بەگرتنی ئێمەتان دا. واتە خوێنەری ئازیز سەیری ئەو گومڕاییە بكە كە مەدخەلییەكان تێی كەوتوون سكاڵا لای ئەمریكییەكان دەكەن و لای ئەوان بوختان بۆ یەكتر هەڵدەبەستن بەو شێوەیەی دژایەتی یەكتر دەكەن، ئەگەر مەدخەلییەكان چەكیان بەدەست بوایە خوێنی یەكتریشیان دەڕشت و كوشتنی یەكتریان حەڵاڵ دەكرد، ئەوەش ئەو كارە بوو كاتی خۆی خەواریجەكان لەگەڵ یەكتر ئەنجامیان دەدا. بۆیە خوێنەری بەڕێز ترسناكترین گرووپ لەسەر كۆمەڵی كوردەواری فیكرەكەی رەبیعی مەدخەلییە .**

**سەیربکەن ( عبداللطیف )لەوەڵامەکەی چی دەڵێت:**

**﴿اقول: كذبت والله فلم استعن بالامريكان في حياتي ولم التق بهم في عمري ولامرة ولم اجلس معهم ولم اطلب منهم المال قط بل الذي فعل كل هذه الامور هو منكم والكل يعلم هذا الرجل وهذا يعلمه الصغار والكبار والسلفيون والعوام و والله استطيع ان اشهد علي هذا الكلام مئات الناس لان هذا الامر متواتر وصار العلم به ضروريا لانظريا﴾ بروانە: ﴿الجواب الصريح لمن بدل المنهج الصحيح ﴾ لاپەڕە ١٠١.**

ئەوە ئەخلاقی مەدخەلییەکانە لەگەڵ یەکتر سەیر بکە جودایی لە بیروبۆچوون لەگەڵ یەکتر بەرەو کوێی بردوون... ڕوو بکەنە ئەمریکییەکان و تۆمەت بۆ یەکتر هەڵبەستن و جاشایەتی بکەن لای ئەوان، بۆئەوەی یەکتر لەناو ببەن،ئەوە حاڵی بیدعەچییەکانی مەدخەلییە. خوای گەورە ئاگادارە مەبەستم لەم نوسینانە تەنها خستنەڕووی ڕاستییەکانە، بۆیە تەنها بەبەڵگەی خۆیان لەگەڵیان دەدوێم .

**چوارکەس و لەتێکن و ناگونجێن بەیەکەوە:**

کێشەی نێوان مەدخەلیەکان لەسەر زەعامەت و یەکتر صفرکردن گەیشتە ماڵی دکتۆر رەبیع مەدخەلی لە مەککە، کەئەمەی خوارەوە **دەقی پرسیارو وەڵام و ڕێکەوتنەکەیانە** ، جاوەرە ئەمانە بە هێندەی ئیسلامیەکان بورنایە ئەبورن بەچەند فیرقەوەو پەنا ئەگرم بەخوا چی دەقەوما ، ئەوەش ڕێکەوتنامەکەیان کە تەواو رەنگدانەوەی بیروبۆچوون و عەقڵی داخراویانەو بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە کە ئەمانە دەروێشی مەدخەلین و ناهەقمان نیە پێیان ئەڵێین مەدخەلی ، فەرموون بەچاوی خۆتان ببینن :

**الحمد لله والصلاه والسلام على رسول الله، وبعد:**

شەیخ رەبیع ئێمەی بانگکرد بۆئەوە پێکبێین ئیختلافی نێوانمان نەهێڵین مامۆستا بەهمەن و لەگەڵ براکەی مامۆستا عەبدوللتیف و برایان مامۆستا خلیل احمد و عدنان بارام لەماڵی شەیخ و عەلامە رەبیعی کوڕی هادی مەدخەلی لەمەککە کۆبوینەوە.

لەسەر ئەو خالآنە پێکهاتین:

یەکەم:

مامۆستا عەبدوللتیف ئەو هۆکارانەی خستە روو کە لەسەریەوە مامۆستا بەهمەنی بەبیدعە چی لەقەڵەم دابوو مامۆستا بەهمەن دیفاعی لەخۆی کرد لەهەندێکیان ،وە لە هەندێ خاڵ پەشیمان بوویەوە.

دووەم:

کاك بەهمەن وەلآمی پرسیارەکانی دایەوە بەوشێوەیەیە لەگەڵ مەنهەجی ئەهلی سونەت و جەماعەت تێکبکاتەوە کەئەوەش باوەڕی مامۆستا عەبدوللتیف و برایەکانێتی وە لەگەڵ وان هاوڕابوو لەسەر بەری بوون لەحیزبییەکان (سەیرکەن کێشەکەیان ودینیان هاتۆتە سەر بەری بوون لە ئیسلامیەکان!!).

سێیەم : لەسەر بنەمای خاڵی یەکەم و دووەم عەبدوللتیف حوکمی تەبدیعەکەی کێشایەوە لەسەر کاك بەهمەن.

(تێبینی : سەیر کەن خۆشەویستان گومرایی ئەو مەدخەلیانە بەبیدعە لەقەڵەم دانی یەکتر تەفسیق و تەبدیعی یەکتر چەند ئاسانە لای ئەوان

بەكەیفی خۆیان خەڵكی بەبیدعەچی لەقەڵەم دەدەن وەبەكەیفی خۆیان ئەو حوكمە لەسەر یەك لادەدەن ئەوەش بەڵگەی جەهالەتی ئەو گروپەیە).

ئالەسەر ئەوە پێكهاتینەوە و برامان بەهمەن رازی نابێ بەتەعن لە برامان باوكی عبدالحق و باقی برایان هەروەها ابو عبدالحق رازی نابێ تەعن لە بەهمەن بدرێ لەبەر ئەوەی ئێستا ئەوان براو خۆشەویستی یەكترِ سەردەخەن .

( تێبینی: خوێنەری بەرێز سەرنجی ئەوە بدەن لەدوای خاڵەكان دەڵێن (ئێستا ئەوانە بران) ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە مەدخەلییەكان زۆر (كالّ فامن) لەشەرعی خوا نازانن خوای پەروەردگار كەباسی ئەو دوو تائیفەی بڕوا داردەكا شەڕیان لەنێوانە دەفەرموێ {إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ } ﴿الحجرات: ١٠﴾ كوشتنی یەكترِ ناوی برایەتی لەسەر یەك هەڵناگرێ بەلاّم ئەو نەفامە مەدخەلیانە وادەزانن كۆبوونەوە لەسەر فیكری رەبیع برایەتیە ئەوەی تر هەموو دوژمنایەتییە).

هەردوكیان سولّحیان كرد، والحمد لله رب العالمين.

أبو عبدالحق: عبداللطيف أحمد أبو عبدالرحمن: بهمن علي

---

الشهود: ١ ـ عبدالله الزوبعي. ٢- أحمد الزهراني.

فتلبية لطلب شيخنا ربيع ـ حفظه الله ـ الداعي إلي الاتفاق والوئام وعدم التفرق، ولما في الصلح من الخير، وهو مرغب فيه أساسا في الكتاب العزيز بقوله سبحانه وتعالي: ﴿ وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾(النساء: ١٢٨)، وقوله: ﴿ إِنَّمَا

الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الحجرات: ١٠) " فاستجاب له الإخوة الكرام وقاموا بما تقدم، فعلي أن يكون الصلح مقرونا بالعدل ـ إذ أنه مشرط به ـ كما يقول سبحانه: ﴿ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴾ (الحجرات: ٩)، أنهم قد وجهوا أسئلة منهجيه للأخ بهمن ليجيب عليها، وذلك عن طريق خطاب للشيخ ربيع وتوجيهه الأسئلة إلي الأخ بهمن،
﴿ لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَي مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ وَإِنَّ اللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ (الأنفال: ٤٢).

**وەلأمەكانی بەهمەن لەسەر پرسیارە مەنهەجییەكان .**

**سەیركەن خۆشەویستان مەنهەجی مەدخەلییەت و مەنهەجی سەلەفی چەندە لەیەك جودان وسەیر كەن مەنهەجی مەدخەلی چۆنە.**

پرسیاری یەكەم :

چی دەڵێی دەربارەی شەیخ رەبیع و مەنهەجەكەی و حوكمی تەبدیعی بۆ ئەو كەسانەی كە تەبدیعی كردوون؟

(تێبنی : سەیر كەن خۆشەویستان ئەو مەهزەلەیەیی بەچاك زانینی رەبیعی مەدخەلی یان كردۆتە مەرجی بوون بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ).

وەلأم : ئەوە بەدینی دەزانم شەیخ رەبیع ئایەتێكە(كەسێكی بێوێنەیە ) لە ناسینی حیزبییەكان وە هەموو ئەوانەی شەیخ قسەی لەسەر كردوون حەقەو قسەكانی راستە دەربارەیان.

پرسیاری٢ : چی دەڵێی دەربارەی دامەزراندنی حیزب لەئیسلام ئایا ئەوە تەنها بیدعەیە یان گوناهە هەروەكو هەندێك لە لایەنگیرانت بۆی دەچن.

وەلاّم : ئەوە بیدعەیە هەروەکو ئەوەم روونکردەوە لەنامەیەك بۆ شەیخ بەر لەسالّێك.. ( شەیخ مەبەستی رەبیعە،ئەمانە ببینە چۆن پێش سالّێك نامەی بۆ ئەو شێخە ناردووەوچۆن تەوجیه دەکرێن لە سعودیەوە ..بەهمەن کەلاری تۆ لەکوێ و رەبیع مەدخەلی تۆ لە کوێ ؟؟)

پرسیاری ٣: ئایا ئەو حیزبە ئیسلامییانە دەچنە چوار چێوەی ئەو ٧٢ فەریقەی بەهەلاکەت چون؟

وەلاّم: من وای دەبینم و باوەڕیشم وایە ئەوانە لەفیرقە بەهەلاکەت چوەکانن .

تێبینی :(ئەی خوا رووتان رەشکات مەدخەلییەکان لەگەڵ رووی رەبیعی گومرا کە فێری ئەو گومراییەی کردوون ، سەدملیۆن ئیخوان ، سەد ملیۆن سۆفی و دەروێش سەدان ملیۆن ئیسلامی تر لە پاکستان و هیندستان و ولاّتانی تر ، ئەمە بیجگە لە عاممەی موسڵمانان کە بەحساب هەموویان بیدعەچین و دۆزەخین )..

پرسیاری چوارەم: چی دەڵێی دەربارەی حەلەبی ( مەبەستی ابو الحارث علي بن حسن الحلبي) یە کاتی خۆی لەگەل رەبیعی مەدخەلیی بوو ئێستا لەیەك جودا بووینەوە و یەکتر تەبیدع و تەفیسق دەکەن) کەشەیخ رەبیع حوکمی بیدعەچی بەسەرا سەپاند پێکاویەتی لەو حوکمە یان نەپێکاوە بەبێ لادان راست وەلاّم بدەرەوە؟

وەلاّم: من یەکەم کەس بووم وشیارم داوە دەربارەی حەلەبی کتێبەکانی منیش بەوە ناسراوم شەیخیش پێکاویەتی و پیاوی ئەو مەیدانەیە.

پرسیاری ٥ : چی دەڵێی دەربارەی شەیخ حەمدی عبدالمجید مەبەستی(حەمدی سەلەفی ئێستا مردوە) چی دەڵێی دەربارەی شەیخ حەمدی کە کەوتۆتە نێو چەند هەڵەیەکی مەنهەجی و چەند بنچینەیەکی گەندەڵ ئەوەی کە بڵاومان کردەوەو رەدمان دایەوە وەچی دەڵێی دەربارەی ئەو قسانەی بەشەیخ رەبیعی گوتوە وە ئەو حوکمەی بەسەر(ابو عبدالحق عبدوللەتیف) ی داوە بەوەی کە گوتی :ئەوە فیتنە دەنێتەوە لەبەر ئەوەی قسەکانی رەبیعی گواستەوە بۆ عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی .

﴿تێبینی(حەمدی سەلەفی) لەنوسینێکیدا دەڵی عەبدوللەتیف سەری هەموو ئەو ئاژاوانەیە کە کەوتە نێو سەلەفیەکان( مەبەستی فیرقەی مەدخەلییەکانە ) ان شاء الله هەوڵ دەدەین بەو نزیکانە قسەکانی (حمدی سەلەفی) لەسەر عەبدوللتیفی مەدخەلی بخەینە بەردیدی خوێنەر.پێگەی مینبەر﴾.

وەڵام: هەڵەی کردوە ( واتە حەمدی سەلەفی ) لەقسەگوتنی بەشەیخ رەبیع وەمن بڵاو کردنەوەی قسەکانی رەبیع بەفیتنە نازانم.

پرسیاری ٦: چی دەڵێی دەربارەی ئەبو مەناری عەلەمی (بەکورتی و بەڕوونی) هەربۆ زانیاری ئەو کەسە سەردانت دەکات دوای ئەوەی شەیخ رەبیع ئەو کەسەی بەبیدعەچی دانا ؟.(ئەبومەناریش لەخۆیان بوو ئێستا بەبیدعەچی دائەنێن و پێی دەڵێن : ئەبو دمار)..

وەڵام : وەڵامی نەدایەوە .....

پرسیاری ٧ : چی دەڵێی دەربارەی مەلا تاریقی کفری ئایا ئەو کەسە سەلەفییە لای تۆ، هەر بۆ زانیاری تۆ ئەو کابرایە زۆر بەهەند هەڵناگری و بەشوێنکەوتوانت دەڵێی ئەوە سوننیە و هاوکاری بکەن.

وەڵام : من بەبرایانم گوتوە(طارق) مەنهەجێکی دیاری کراوی نییە.

پرسیاری ٨: چی دەڵێی دەربارەی ( کمال حسن ) هەر بۆ زانیاری لەو نامەیەی بۆ برایانی بەریتانیات ناردوە کە وێنەیەکی بۆ شەیخ رەبیع چووە دەڵێی ئەو کەسە خوا هیدایەتی داوەو وازی لەحیزبایەتی هێناوە بەڵام لەواقیع دا وانیە ئەو کەسە وا دەبینێ کە حیزب و رێکخستن واجیبە نەك هەر رێی پێدراوە هەروەکو خۆی وادەڵێ دوای ناردنی نامەکەی تۆ بەچەند مانگێك وە بەدەنگیش لامانە هەر وەکو لەوەڵامەکەی ئەبو سوننە بۆ تۆ ئەو دەنگە نوسراوەتەوە وەڵامەکەی ئەبور سونە بەناوی ( فتح الباري في كشف زيف ادعاءات وتدليسات المدعو بهمن الكلاري )

وەڵام : لای من دەڵێ من سەلەفیمە وگوێم لە هەندێك برا بوو کە گوتویەتی من سەلەفی نییم وە جارەکیان پرسیارم لێکرد: ئەتۆ لای من دەڵێی سەلەفیم و لەبەر چی لەو دەنگە تۆمار کراوە پێچەوانەی ئەوەت گوتوە ؟ گوتی وام ووتوە لەبەر ئەوەی ئەو کەسەم نەناسیوە کە پەیوەندی پێوە کردووم.

تێبنی ( بزانە بەرێزم ئەو مەدخەلیانە لەنێو خۆدا دەنگی یەك تەسجیل دەکەن و یەکتر بەگرت دەدەن ، چی خراپە ئاوا بەیەك دەکەن هەر وەکو

لەنوسینێکی عەبدوللتیف پێشتر باسمان کرد کەچۆن چونەتە لای ئەمریکییەکان و یەکتریان بەگرت داوە ).

پرسیاری ٩: چی دەڵێی دەربارەی نوسینەوەی وەڵام لەسەر کەسی موخالیف ئایا ئەو کارە تەنها پەیوەستە بەزانایان یان دەشێ قوتابی زانستی شەرعیش بەو کارە هەڵسێ؟ وە ئایا پەشیمان بوویەوە لەو ئامۆژگارییەی بۆ برا ( کۆیی) ت کردبوو بەوەی ئەوە نوسینانە بسوتێنی لەوەڵامی سەید قوتب نوسرابوەوە یان هەر لەسەر ئەو بۆچونەی هەر بۆ زانیاریت ئەوە کەسە شایەتە لەسەرت؟

وەڵام: من وای بۆ دەچم وەڵام دانەوە لەسەر کەسی موخالیف واجیبی شەرعییە.

پرسیاری ١٠: لەبەر چی وەڵامی گۆڤاری (رێگا)ی تەکفیرت نەدایەوە ئەو گۆڤارە قسان بەسەلەفییەکان دەڵێ و مەدحی تۆو ملا تاریق دەکاو بەکەسی میانڕەو ناوتان دەبا لەبەر ئەوەی لەگەڵیان نەرمی وە وەصفی سەلەفیەکان دەکا بە بیدعە چی و خەواریج ؟ بەقسەی ئەو رازیت.

وەڵام : وەڵامی ئەو پرسیارەی بەشێوەیەك دایەوە لێی رازین و لەبڵاو کراوەیەکی تایبەت بڵاو کراوەتەوە.

پرسیاری ١١: چی دەڵێی دەربارەی ئەوانەی نوسینی ﴿مذکرة الوثائق الجلية التي يتعامي عنها أدعياء السلفية ﴾ بڵاو دەکەنەوە کە لەو نوسینە مەدحی سەید قوتب و حەسن بەنناو عائز قەرەنی و سەلمان عۆدەو سەفەر و سروریەکانی کراوە؟

وەلاًم: ئەوەی ئەو جۆرە کتێبە بلاًو دەکاتەوە کە بەرگری دەکا لەو کەسانەی باستکرد و قسان بەشەیخ رەبیع دەڵێ ئەوانە وەکو ئەو کەسانەن کە لایان داوەو زانایان قسەیان پێگوتون.

پرسیاری ١٢:چی دەڵێی دەربارەی ئەبونوری کوردی ؟ وە ئایا راستە تۆ سەردانیت کردوە لەمەدینە بەر لەچەند رۆژێك؟

تێبینی (ئەبوو نور الکردی ئێمە لەپێگەی مینبەر بابەتێکمان لەسەر ئەو کەسە بلاًو کردوە کلیکلی ئەو لینکە بکە).

http://www.pegayminber.com/index.php/naseny-madxalykan/babatkan/402-2012-10-20-12-23-20

وەلاًم : وەلاًمی نەدایەوە.

پرسیاری ١٣: چی دەڵێی دەربارەی ئەو بۆچونەت کەدەڵێی هەر نوسینیك کەسێك دەینوسیٚ نابیٚ بەر لەتەمەنی ٤٠ساڵی بلاًوی بکاتەوە.

وەلاًم:دەڵێم ئەوە جائیزە.

پرسیاری ١٤: چی دەڵێی دەربارەی ئەوانەی نووسینی (رفقا أهل السنە ) بلاًو دەکەنەوە هەر بۆزانیاری هەندێك لە نزیکەکانی تۆ ئەو نامەیان بلاًو کردۆتەوە چی دەڵێی دەربارەی ئەوە وحوکمی ئەو کەسە لای تۆ چیە کە ئەو کتێبە بلاًو دەکاتەوە؟

( تێبینی: کتێبی (رفقا أهل السنة باهل السنة ) لەنوسینی شەیخ(عبد المحسن بن حمد العباد البدر) بەلام لەبەر ئەوەی رەخنەی توند لەمەدخەلیەکان دەگریٚ مەدخەلیەکان لێناگەڕێن ئەو کتێبە بلاًو ببیتەوە وە ئەو کەسەش لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکریٚ ئەگەر بێت و ئەو کتێبە بلاًو بکاتەوە ئەو

کارەی مەدخەلیەکان لەموحاسەبەکردنی شوێنکەوتەکانیان لەکاری فرقەی (باطنیة)کان دەچێ خوای گەورە بمان پارێزی لەو گومراییە ان شاء الله لەمینبەر کتێبی (رفقا أهل السنه باهل السنه) لەگەل بابەتێکی تایبەت لەسەر ئەو کتێبە بلاّو دەکەینەوە.) .

وەلاّم: بیستومە کەزانایان وەلاّمی ئەو کتێبەیان داوەتەوە و هەندێك هەڵەی تییایە من وای دەبینم بلاّوکردنەوەی ئەو کتێبە فیتنە دەخاتە نێو سەلەفییەکان ( مەبەستی مەدخەلییەکانە)

پرسیاری ١٥: حوکمی دیراسەکردن لای ئەهلی بیدەع چییە.

وەلاّم : من ئامۆژگاری ئەو برایانەم کردوە کەزانیم مەبەستیانە سود لە هەندێك لەحیزبییەکان وەرگرن وازیان لێبهێنن و لەبەر ئەوەی ئەوە بەگەورە روانینی ئەهلی بیدەعی تێدایە و رەواجدانە بەمەنهەجەکەیان.

جالە سەر ئەوە و هەروەکو لەقسەی مامۆستاکان کەلەسەرەتای ئەو صولحە ناویان هاتووە برا(بەهمەن)بە یەکێك لە برا سەلەفیەکان هەژماردەکرێ و لەگەڵ رێزمان بۆ ئەو هەڵوێستانەی خوا پاداشتی بداتەوە لەخوا داواکارین ئێمە و ئەو سەربخا ئەو ئاشتبوونەوەو پاشەکشێیەی لەبۆچونەکانی پێشوی دەرگای فیتنە دادەخا لەرووی ناحەزان لەتەکفیرییەکان و حیزبیەکان و دوژمنانی سەلەفی .

(ئای قوربەسەر ئەو میللەتە کە ئەمانە ئەبنە پێشەوای ، شەرو ناکۆکیان گەیشتە ئەوەی مەلا لەتیف بەبەهمەنی دەوت :س....گ ، ئێستا کە دەروێشی خۆی سەلماند بۆ بیروبۆچوونە سەقەتەکەی شێخ رەبیع بەحساب

ڕێکەوتنەوەو بیدعەچێتی و گومڕایان لەسەرهەڵگرت و لە دۆزەخ دەریانهێنا بەرەو بەهەشت ،سەیربکەن ئەمانە ئەچنە سعودیە بەناوی عومرەو خوێندنەوە خەریکی چ بەزمێکن!! )..

**شەڕی نێو خۆی مەدخەلیەکان کەوتە سەرکەنالە ئاسمانیەکان :**

یەکێك لەوانەی کەکاتی خۆی لەگەڵ ڕەبیعی مەدخەلی بوو(علی الحلبی) بوو دواتر لەبەر ئەوەی ئیختلاف کەوتە نێوان ئوردن و سعودیە ئەو زانایانەی سەربەسولتانن ئەوانیش بوون بە دوو بەش علی حەلەبی ئەردەنی کەوتە دیفاع کردن لە پادشای ئەردەن و ڕەبیعی مەدخەلی کەوتە دیفاع کردن لە مەلیکی عەرەبستانی سعودیە هەردوولا دەڵێن ئیمە سەلەفین هەردوو لاش یەکتر تەفسیق دەکەن فەرموون لەگەڵ قسەی یەکێك لەناسراوەکانی خەتەکەی(علی الحلی) کەناوی( محمود ڕەزوانییە) باسی (ڕەبیع) دەکا.(سەیری پێگەی مینبەر بکەن).



**دکتۆر یوسف ئەستێس :**

ناوبراو چالاکترین بانگخوازە لە ئەمەریکای باکورو کەناڵی (هودا)ی دامەزراندووە بە زمانی ئینگلیزی و لەهەموو هۆکارەکانی تری راگەیاندنیشدا رۆڵی باشی بینیوە بەتایبەت ژووری ئاخاوتن لە ئینتەرنێتدا و بەهەزاران کەسی موسڵمان کردووە .

ناوبراو لەساڵی ١٩٤٤ لەدایك بووەو لە ساڵی ١٩٩١ موسڵمانبووەو تاساڵی ١٩٩٨ لە مەغریب و میصرو تورکیا خۆی فێری عەرەبی کردووە ،دکتۆرای هەیە لە لاهوتدا و پرۆتستانتیەو بازرگانی ئامێری مۆسیقاشی دەکرد لەگەڵ باوکیداو ملیۆنەربوون .



دکتۆر یوسف ڕەخنەیەکی توند لە دەسەڵاتدارانی سعودیە دەگرێت و دەڵێت : ئەوان پەیڕەوی ئیسلام ناکەن ، ئەگەر ئافرەت بۆی هەبێت سواری وشترو وڵاخ ببێت ، ئیتر بۆ ئەبێت ڕێی لێخوڕینی ئوتۆمبیلی لێبگیرێت ..لەبەرئەوەی دکتۆر یوسف ئەستێس دەڵێت سعودیە پەیڕەوی ئیسلام ناکات مەدخەلیەکان کەوتوونەتە زەم کردنی .

**حاشاکردن :**

عەبدوللەتیف لە وتارێکی چەمچەماڵدا ساڵی ٢٠١٤ لەبەردەم سەدان کەسدا ، قسەی بەئیسلامیەکان وت و سوێندی خوارد کەئەوانەی لەگەڵیانان ناچنە بەهەشتەوەو دابەزیە سەر قانع خورشیدی بانگخوازو نووسەرو وتی: ئەو قانیع خورشیدەی قانیعە بە درۆو بوختان و بیدعە دژی مەنهەجی سەلەفیە ..کە پێی وترایەوە حاشای لێکردو وتی : تەشهیرم پێنەکردووە ، جا خۆش بەختانە مۆبایل خۆش بێت تۆمارکرابوو ئێستا لە دادگادایە مەسەلەکەیان ..لە کاتی وانەوتنەودا قسەی بە صۆفیەکان وتبوو ، مامۆستا مەلا مەسعود پێی وتبوو: بۆچی زەمت کردووین ؟؟حاشای لێکردو وتی: نەموتووە ، لەکاتێکدا قوتابیەکان شایەتن کەوتوویەتی!!

خوا شایەتە هەرچی نەمان دیبوو لەم سەلەفیە تەزویرە مەدخەلیانەمان بینی ، ئینکار ناکرێت سەلەفی خواناسی ڕاستەقینەی بۆ خوا سوڵحاو هەیە ، وەك شێخ محمد حسان و شێخ محمد حسێن یەعقوب و شێخ جوەینی لەمیسرو شێخ عبدالرحمان عبدالخالق لە کوەیت و هەزارانی تر کەدەم ودەستیان پاکەو هەموو موسڵمانانیان خۆش دەوێت و بیروبۆچوونی مەدخەلیش بەهەڵە دەزانن ..

## دوژمنایەتی سعودیەو ئیمارات:

سعودیەو ئیماراتیش بۆیە ئاوا دژایەتی ئیخوان دەکەن ، چونکە دەسەڵاتیان دەسەڵاتی بنەماڵەیەو لە دەسەڵاتەکەیان دەترسن و، تەنها ئیخوانە کە بەڕاستی داوای چاکسازی ودادپەروەری کۆمەڵایەتی دەکات و توانای ئیخوانش خۆیان دەزانن کەم نیە ، هەروەك (یوسف نەدا) گەورە کەسایەتی ئیخوان لەبەرنامەی (بلاحدود)دا رایگەیاند کەئیخوان لە ۷۲ وڵاتی هەرحەوت کیشوەرەکەدا هەن و نزیکەی سەدملیۆن کەسن !!

ئێستا هێرشێکی نێودەوڵەتی هەیە دژی ئیخوان، وڵاتانی کەنداوو ئەمەریکاو بەریتانیا بەئاشکرا کەوتوونەتە خۆیان بۆ بەرتەسککردنەوەی ئازادیەکان لە ئیخوان ، کارگەیشتۆتە ئەوەی (۱۸۰ )هەزار ئیخوان لە بەندیخانەکانی میسردان و ماڵ و موڵکیان دەستی بەسەرداگیراوە.

لەوڵاتانی کەنداویش بەسەدانیان بەندکردووەو بەهەزارانیشیان نان براوکردوون وجنسیەیان لێسەندونەتەوە..لەئەنجامی ئەوەی لەئیمارات لەم ساڵانەی دواییدا جەمعیەی ئیصلاح بە سەرۆکایەتی(شێخ سوڵتان بن کاید القاسمی) کە هەر لەبنەماڵەی ئەمیرەکانە سەر بەقوتابخانەی برایانە داوای چاکسازی سیاسی کرد.

## حەفتەرو دەفتەر!!

لیوای خانەنشین حەفتەر بە دەفتەرە دۆلارەکانی سعودیەو ئیمارات و بە پشتگیری مادی و مەعنەوی سیسی ئەیانەوێت لیبیا بەرەو شەڕی

ناوخۆ بەرن وبۆ ئەمەش رەبیع مەدخەلی داوای لە شوێنکەوتووانی کردووە کە پشتگیری حەفتەر بکەن بۆ لەناوبردنی ئیخوانی لیبیا هەروەك لەوێنەکەدا دیارە ، ئەوەیە دینداری !!گوایە کەئیخوانی لەناوبرد لەگەڵ سیسیدا تەتبیقی شەریعەت بکەن ، لەکاتێکدا وا سیسی شەریعەتی سەربڕی و ئیعلانی عەلمانیەت دەکات..

دکتۆر وەلید فتێحی دەڵێت: بیست هەزار خانووی تەجاوز هەیە کە خەڵکی بێنەوای تیادەژی لە جەدەدا وبۆ ئەوەی قەدری عافیەت بزانین خۆم و مناڵەکانم جاروبار سەردانیان دەکەین و ئیبراهیمی کوڕم بەو مناڵیەشەوە تورە دەبێت لەنادادی دەوڵەتی بەناو ئیسلامی کەپارەکانی بۆ کوشتنی موسڵمانان و ئاژاوەنانەوە بەکاردێنێت .



**دوو ئیعتیرافی گرنگ :**

١-راوێژکاری وەلی عەهدی ئەبوزەبی دانی نا بەوەدا کە هەموو ئەو دۆلارانەی ساڵێکە ئەیدەین بەمیسر کارێکی فاشیلەو ئیمارات خۆی ناشرین کردووە لای ملیۆنەها لایەنگری ئیسلامی کە ئیمارات بەسەرسەختترین دوژمنی ئیسلامی سیاسی دەزانن .جائەم ئیعتیرافاتانە زەروورن بەڵکو کاربەدەستانی ئەو وڵاتە هۆشیان بێتەوە.

٢-رەفسەنجانیش کەوتە بەر رەخنەی دەزگا شیعەکان کەوتی کەوتی هەوڵی بەشیعەکردنی ئەوان وقسەوتن بە هاوەڵان داعشی دروست کرد وەك کاردانەوەیەکی سوننەکان ، هەروەها کەوتی ، خیلاف و دژایەتی یەکتر رێپێنەدراوە لەئیسلامداو ئێمە پەیرەوی ئەم ئایەتەمان نەکردووە لەسیاسەتماندا (ولاتنازعوا فتفشلوا وتذهب ريحكم ) .



## دواوته

کوردی خێر نەدیو لەگەڵ ئەو هەموو ستەمەی لێی کراوە لەلایەن دۆست و دوژمنەوە ، هەرئەوەی کەم بوو کە بیرو بۆچوونی سەقەتی سعودیەی بۆ بهێنن کەسەلەفی تەزویرن ولەیەك کەسەوە سەرچاوەی گرتووە بەناوی دکتۆر ڕەبیع مەدخەلی ، سەرەتا زانایەك بووە و ڕەنگە قسەی لەسەر نەبووبێت و مەدحیش کرابێت ، جا دەروێشەکانی ئەو مەدحە کۆنانە هەرچەند زۆرکەمن دەهێنن و دڵی خۆیانی پێخۆش دەکەن ، ئیتر داماوانە نازانن کەدوای ئەوەی بەهۆی زاواکەیەوە بووە پیاوی موخابەراتی سعودی زۆربەی زانایانی سعودی و دەرەوەش بەرپەرچی قسەکانیان داوەتەوەو دیارە کەسیش مەعصوم نیە ، ئەمەش شێخ حجوری گەورە زانای سەلەفی یەمەنی باسی دەکات کاتێك ویستیان بەدۆلارەکانیان بیکڕن و بیخەنە تۆڕەکەوە ملی بۆ نەدان و خۆی نەفرۆشت..

خۆ ئەمانە ئاشکرایە تۆزی بەربان و زۆرنامێننەوە بەڵام کوردوستان بەرگەی ئاژاوەو ئەم بیروبۆچوونەسەقەتە ناگرێت ، ئەمانە غەیری خۆیان بەبیدعەچی دەزانن و هانی دەروێشەکانیان ئەدەن کەنابێت سەلام لەو خەڵکە بیدعەچیە بکەن و گوایە جوولەکەو گاور لە بیدعەچی باشترن ..

بەهەرحاڵ ئێمە بەم نامیلکەیە مەبەستمان بەرچاوڕوونیەو مەبەست کەسەکان نیە و واجیبمانە ئەوەی هەقە بیخەینە ڕوو هەرکەسیش ئازادە شوێن هەرچی دەکەوێت (قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٠٨)یوسف..